الفرق بين قانون المرافعات المدنية و قانون اصول المحاكمات الجزائية

**یەکەم: جیاوازی لە رووی بەرژەوەندیەوە.**

**دووەم: جیاوازی لە رووی سزاوە.**

**سێیەم: جیاوازی لە رووی ئامرازەوە.**

**اهداف قانون المرافعات المدنية**

**بنەما و ئامانجەکانی یاسای مرافعات**

**یەکەم: تبسیط الشکلیة فی العمل القضائی : ئاسانکاری رۆتین و شکلیە لە کاری دادگەری:**

**رۆتین لە کاری دادگەری شتێکی تازە نییە، بەڵکو کۆنە لەگەل کۆنایەتی کاری دادگەری، بۆ نموونە ئەگەر بگەرێینەوە بۆئیجرائاتی دادگەری لە یاسای رۆمانی ئەوە دەبینین کە مەراسیم و رموزو شکلیات خۆی زاڵ کردبووە سەر بونی ماف و داواکردنی بەرامبەر بە دادگا. وە دەرەنجامی ئەو شکلیاتە ئەوە بوو کە هەر خراپ جولانەوەیەك یان جوان بەکارنەهێنانی وشەکانی داوا وای دەکرد کە خاوەن ماف مافەکەی لە دەست بدات.**

**دووەم: العمل على تحقيق القضاء العادل والعاجل : کارکردن بۆ بەدیهێنانی دادگایەکی داد بەپەلە:**

**ئامانجی سەرەکی دادگا ئەوەیە کە دڵنیایی پارێزگاری یاسای بۆ خەلکی فەراهەم بکات بەبێ جیاوازی لە نێوانیاندا، وە تەنها دەرچونی حوکمێکی دادپەروەرانە بەس نییە بەڵکو پێویستە ئەو حوکمە سەریع وبە پەلە بێت وە بە کولفە و خەرجییەکی کەم لەسەر خەلکی رابوەستێت.**

**ثالثا: منح القاضي دوراً ايجابياً في العمل القضائي: بەخشینی دادوەر رۆلێکی باش و پۆزەتیڤ لە کاری دادگەری:**

**دادوەر ئەو کەسەیە کە دەولەت کاری جێبەجێکردنی یاسای مەوزوعی و ئیجرائی پێ سپاردووە لەو داوایانەی کەدێنە پێشی، هەر بۆیە پێویست بەوە دەکات کەیاسادانەر رۆلێکی گرنگ و زۆر بداتە دادوەر بۆ ئەوەی بگاتە حوکمێکی راست و دروست و دادپەرەوەر.**

**یەکەم: سەربەخۆیی دادگا:**

**ماددەی (٦٣)ی دەستوری عیراقی ساڵی ١٩٧٠ ی ملغی ئاماژە بە بنەمایەکی گرنگ دەکات ئەویش ئەوەیە (( القضاء مستقل لا سلطان عليه لغير القانون ))، واتە (دادگا سەربەخۆیە و هیچ دەسەلاّتێك لە سەریدا نییە جگە لە دەسەلاّتی یاسا نەبێت )، وە ئەم بنەمایە ئاماژەی پێکراوە لە دەستوری هەمیشەیی نوێی عیراقی بۆ ساڵی (٢٠٠٥) لە ماددەی (١٩ / یەکەم)دا, وە پرۆژەی دەستوری هەرێمی کوردستانی عیراق ئاماژەی بەم بنەمایە کردووە لە بەرگرنگی لە ماددەی (٧٨)، هەروەها یاسای دەسەلاّتی دادوەریی هەرێمی کوردستان – عیراق ژمارە (٢٣)ی ساڵی (٢٠٠٧) لە ماددەی (٢) دا ئاماژەی بەم بنەمایە کردووە.**

**پ/ ئایە دادگا لە هەرێمی کوردستان سەربەخۆیە لە رووی یاساییی؟**

وەڵام: سەربەخۆیی دەسەڵاتی دادوەری لە هەرێمی کوردستان– عێراق لە رووی یاساییەوە بەروونی دیار نیە، واتا ئەگەر لە لایەکەوە تەماشای ئەم بابەتە بکەین دەتوانین بڵێن بەڵی سەربەخۆیە، بەڵام ئەگەر لە لایەکی ترەوە تەمەشای بکەین ئەوە دەڵێن نەخێر سەربەخۆ نیە:

بۆ نموونە ئەگەر لە رووی ئەم سێ خاڵەوی خوارەوە تەمەشای سیستەمی دادوەری لە هەرێمی کوردستان بکەین ئەوە دەڵێن بەڵی سەربەخۆیە:

١- لە دوای دەرچوونی یاسای دەسەلاتی دادوەری هەرێمی کوردستان– عیراق ژمارە (٢٣) بۆ ساڵی ٢٠٠٧ دادگاکانی کوردستان جودا بونەوە لە وەزارەتی داد کە بەشێکە لە حکومەت، چونکە پێش ئەم یاسایە دادگاکان بەشێك بوون لە وەزارەتی داد وە ئەمەش وای دەکرد پاشکۆی دەسەلاتی جێ بەجێ کردن بن.

٢- لە ماددەی (٨/ یەکەم/ ٨) لە یاسای پەیمانگەی دادوەری هەرێمی کوردستان– عێراق ژمارە (٧)ی ساڵی ٢٠٠٩ دا هاتووە کە پێویستە پالێوراو بۆ پۆستی دادوەری حیزبی نەبێت یان سەر بەهیچ لایەنێکی سیاسی نەبێت، ئەگەر حیزبی بوو ئەوا پێویستە کاتێ بۆ پەیمانگەکە پێشکەش دەکات پەیوەندی خۆی بە حیزبەوە ببچڕێنێت، واتا نابێ دادوەر کەسێکی حزبی بێت هەر بۆیە سەربەخۆیە لە دەسەلاتی حزبەکان.

٣- دادوەران لە هەرێمی کوردستان بە مەرسومێکی هەرێمی لە لایەن سەرۆکی هەرێمەوە دادەمەزرێن بە پێی ماددەی (١٨) لە یاسای پەیمانگەی دادوەری هەرێمی کوردستان– عێراق دا، واتا حکومەت ناتوانێ دادوەران دابمەزرێنێ بۆیە هیچ دەسەلاتێکی لەسەر دادوەران نیە.

بەلام لەلایەکی ترەوە ئەگەر لە رووی ئەم چوار خاڵەوی خوارەوە تەمەشای سیستەمی دادوەری لە هەرێمی کوردستان بکەین ئەوە دەڵێن نەخێر سەربەخۆ نی یە:

١- دادگای کارگێری کە گرنگترین و بەرزترین دادگای پلە یەکە سەربەخۆ نیە لە حکومەت، چونکە بە پێی ماددەی (١٢) لە یاسای ئەنجومەنی شوورای هەرێمی کوردستان - عیراق ژمارە (١٤) ی ساڵی ٢٠٠٨ ئاماژە بەوە دەکات کە وەزیری داد بۆی هەیە دادگای کارگێری لە سەنتەری پارێزگاکان لە هەرێم بە پێی پێویستی بەرژەوەندی گشتی دابمەزرێنێ، بە سەرۆکایەتی دادوەرێك لە پۆلی یەکەم و ئەندامێتی دوو دادوەر لە پۆلی دووەم یان سێیەم یاخود ئەندامێتی دادوەرێك و ڕوایێژکارێك.

٢- لە پاش دەرچونی یاسای پەیمانگەی دادوەری هەرێمی کوردستان– عێراق ژمارە (٧) ی ساڵی ٢٠٠٩ ئەوە دادوەران بە پێی ئەم یاسایە دادەمەزرێن، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسامی وتێبینی ئێمەیە ئەوەیە کە ماددەی (هەشتەم/ دووەم) لە یاسای پەیمانگەی دادوەری هەرێمی کوردستان– عێراق ژمارە (٧) ی ساڵی ٢٠٠٩ دەڵێت: (ئەو پارێزەرانەی لە پەیمانگاکە بۆ مەبەستی ئامادەکردن و شیاندن قبوڵ کراون، لە حوکمەکانی برگەی (٧، ٨)ی (یەکەم)ی ئەم ماددەیە دەبووردرێن). وە برگەی (٨) دەلێ: (٨- پێویستە حیزبی نەبێت یان سەر بەهیچ لایەنێکی سیاسی نەبێت، ئەگەر حیزبی بوو ئەوا پێویستە کاتێ بۆ پەیمانگەکە پێشکەش دەکات پەیوەندی خۆی بە حیزبەوە ببچڕێنێت)، کەواتە مەرجی حیزبی نەبوونی پارێزەرە کە دوای دوو ساڵ دەبێت بە دادوەر هەڵگیرا و ئەوان ناگرێتەوە، وە دواتر دەبنە دادوەرێکی حیزبی و سەربەخۆیی دادگاکانیش دەکەونە ژێر پرسیارو مەترسیەوە.

٣- هيچ دادوەرێك لە هەرێم دانامەزرێ تەنها لە رێگەی ئەم پەیمانگەیەوە نەبێ، وە بە پێی ماددەی (١) لەم یاسایە ئەوە پەیمانگەی دادوەری سەر بە وەزارەتی داد دەبێ، کەواتا ئەو قوتابیانەی کە وەردەگیرین لە معهد **قضائي** ئەوە وەزیری داد کە سەر بەحکومەتە وەریدەگرێ.

٤- ماددەی (هەژدەهەم) لە هەمان یاسادا ئاماژە بەوە دەکات کە دەرچووی پەیمانگە بەپێی فەرمانی (مرسوم)ی هەرێم دادەمەزرێ لە مەنسەبی قازی سنفی چوارەم یان جێگری داواکاری گشتی لە سنفی چوارەم،، لە کاتێکدا کە سەرۆکی هەرێم سەرۆکی باڵای دەسەڵاتی جێبەجێ کردنەوە واتا سەر بەحکومەتە.

لە کۆتاییدا ئەوە دەرەنجام دەکەین کە دادوەران لە هەرێمی کوردستان سەربەخۆیەکی تەواویان نیە، سەرەرای ئەوەی کە دادگاکان سەر بە وەزارەتی داد نین و بەڵکو سەر بە ئەنجومەنی باڵای دادوەرین، جگە لە دادگای کارگێری نەبێ.

**دووەم: ولاية المحاكم**

**ماددەی (٢٩) ی یاسای مرافعاتی مەدەنی دەڵێت ((تسری ولاية المحاكم المدنية على جميع الاشخاص الطبيعية و المعنوية بما في ذلك الحكومة وتختص بالفصل في كافة المنازعات الاّ ما استثنى بنص خاص)). واتا: دەسەڵاتی دادگای شارستانی جێبەجێ دەکرێت بەسەر هەموو کەسێکی سروشتی و معنوی، هەروەها حکومەتیش، وتایبەتمەندە بە تەمەشاکردنی هەموو کێشەکان إلاّ مەگەر یاسایەکی تایبەت ئیستیسنای چەند حالەتێکی دیاری کراو بکات.**

**پرسیار/ ئایا دادگا مەدەنی دەتوانێت بڵێت من سەیری ئەم دەعوایە ناکەم ؟**

**وەلام / : نەخێر دادوەر یان دادگا ناتوانێت وا بڵێت، چونکە یاسا ئیلزامی (ناچاری) دادگا دەکات کە سەیری هەموو داوایەك بکات، وماددەی (٣٠) لە یاسای مرافعاتی مەدەنی دەلێت ((لا يجوز لّيه محكمه أن تمتنع عن الحكم بحجه غموچ القانون او فقدان النص او نقصه وإلاّ عدّ القاچی ممتنعاً عن احقاق الحق، ...... ).**

**وەئەگەر هاتوو یاسا (غامض) و ناروون ولێڵ بوو ئەوە رێگەی تەفسیرو راڤە دەگرێتە بەر نەك امتناع کردن لە جێبەجێ کردنی، چونکە ئیمتناع کردن لە جێ بەجێکردنی یاسا بە مانای ئیلغا کردنی دێت وە ئەمەش لە دەسەڵاتی دادوەر نییە. بەڵام لە حاڵەتی (فقدان النص) ئەوە پێویستە لە سەر دادوەر ماددەی یەکەم لە یاسای مەدەنی عیراقی جێ بەجێ بکات.**

**پ/ ئایە دادگای جینائی دەتوانێت بڵێت من سەیری ئەم دەعوایە ناکەم؟**

**وەڵام: نەخێر**

**تعريف القاضي وطرق اختياره: پێناسەی دادوەر وە رێگاکانی هەڵبژاردنی:**

کار و وەزیفەی دادگا یەکێکە لە وەزیفە گشتیەکان لە وڵات، ئامانجی بەدیهێنانی سوودی گشتی و دادپەروەریە بۆ مرۆڤایەتی، هەروەها نەهێشتنی کێشەکان و وەرگرتنەوەی ماف لە ستەمکاران وگێرانەوەی بۆ ستەملێکراوانە، هەر بۆیە پێویستە ئەم کارە بسپێردرێت بە کەسانی شارەزا ولێهاتوو کە هەموو مەرجەکانی بوون بە دادوەری تێدابێت. وە تەنها بوونی دامودەزگای دادگەری و دادوەر بەس نییە بۆ فەراهەمکردنی حوکمی دادپەروەرانە لە نێوان خەڵکیدا

بەڵکو پێویستە ئەو کەسەی کە وەزیفەی دادوەری دەگریتە دەست و دەچێتە ناو دامودەزگای دادگەی کەسێکی هەڵبژێردارو بێت و جێگەی متمانەی هەموان بێت لە رووی راستگۆیی و دادپەروەری و بیٚ لایەنی و .....هتد. وە بوونی دەسەلاٚتی دادوەری سەربەخۆ و لێهاتوو لە هەر وولاٚتێك نیشانەی پێشكەوتنی ئەو وولاٚتەیە.

**باسی یەکەم: پێناسە دادوەر** (القاضي - magistrate):

ئێمە لە هەرێمی کوردستانی عێراق چەند یاسایەکمان هەیە کە پەیوەندیان هەیە بە کاری دادوەری وەکو یاسای دادبینی شارستانی عێراقی ژمارە (٨٣) بۆ ساڵی ١٩٦٩( قانون المرافعات المدنيه العراقى رقم (٨٣) لسنه ١٩٦٩)، وە یاسای رێکخستنی دادوەری عێراقی ژمارە (١٦٠) بۆ ساڵی ١٩٧٩ ( قانون التنظيم القضائي العراقي رقم "١٦٠" لسنه ١٩٧٩)، وە یاسای دەسەلاٚتی دادوەری هەرێمی کوردستان - عێراق ژمارە (٣٠) بۆ ساڵی ٢٠٠٧ (قانون السلطة القضائية لاقليم كوردستان العراق رقم "٣٠" لسنه ٢٠٠٧)، وە یاسای پەیمانگای دادوەری لە هەرێمی کوردستان - عێراق ژمارە (٧) بۆ ساڵی ٢٠٠٩ (قانون المعهد القضائي في اقليم كوردستان - العراق رقم (٧) لسنه ٢٠٠٩)، بەلاٚم هیچ کام لەم یاسایانە پێناسەی دادوەری نەکردوە، چونکە لە ئەصڵدا پێناسەکردن کاری یاسادانەر (مشرع – پەرلەمان) نیە، بەڵکو کاری زانایانی یاسا و إجتهادی دادگاکانە.

وە ئەگەر بگەرێنەوە سەر رای زانایان ئەوە دەبینین کە هەندێکیان پێناسەی دادوەریان کردووە بەوەی کە: هەر کەسێکە کاری دادگا بگرێتە دەست جا دادوەر بێت لە دادگاکانی پلە یەك یان لە داواکاری گشتی، یاخود راوێژکار بێت لە دادگای تێهەڵچونەوە (استئناف) یا دادگای پێداچونەوە (تمييز).

وە هەندێکی تری یاساناسان وا پێناسەی دادوەریان کردوە بەوەی کە : هەر کەسێکە پۆستی دادگا بگرێتە دەست جا وەکو دادوەر یاخود راوێژکار، وە لەهەر لایەنێکی دادوەری بێت (دادگای ئاسایی یاخود کارگێری)، وە لە هەر پلەیەکی دادوەری بێت ( لە دادگاکانی پلە یەك بێت یاخود دادگاکانی پلە دوو)، یاخود ئەو کەسەیە کە راسپێردراوە بە جیٚ بەجیٚ کردنی یاسا و دادپەروەری وە ئەو دەسەلاٚتەی پیٚ بەخشراوە.

**باسی دووەم: رێگاکانی دیاری کردنی دادوەر (طرق اختيار القاضي):**

تەشریعاتەکانی ولاٚتان جیاوازیان هەیە لە چۆنیەتی هەڵبژاردنی دادوەران وەئەمەش دەگەرێتەوە بۆ جیاوازیان لە رووی مەنهەجی رامیاری و کۆمەلاٚیەتی و کلتوری هەر ولاٚتێك لەگەڵ ولاٚتانی تر، بەلاٚم بەشێوەیەکی گشتی سیٚ رێگای سەرەکی هەیە بۆ هەڵبژاردنی دادوەران کە ئەمانەن:

رێگەی یەکەم– هەڵبژاردنی دادوەر (انتخاب القاضي).

رێگەی دووەم– دامەزراندنی دادوەران لە لایەن حکومەتەوە، واتە (تعيين القضاة من قبل الحكومة).

رێگەی سێیەم– دیاریکردنی هاوبەش (الاختيار المشترك).

وە لەخوارەوە باس لە هەر رێگایەك دەکەین بە شێوەیەکی سەربەخۆ لەگەڵ دیاریکردنی باشە و خراپەی هەر رێگایەك.

**ڕێگەی یەکەم- هەڵبژاردنی دادوەر (انتخاب القاضي):**

هەندێك لەو یاسایانە بە ڕێگەی هەلبژاردنی دادوەر (انتخاب القاضي) دەبەن، بۆ نموونە: وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وروسیا وسویسرا ڕێگەی هەلبژاردنی دادوەر پەیڕەو دەکەن.

**باشەکانی ئەم ڕێگایە ئەمانەن:**

١- سەربەخۆیی دادگا دەپارێزێ لە دەسەلأتی جێ بەجێ کردن (یحقق استقلال القضاء عن السلطة التنفیذیة): چونکە بە پێی ئەم ڕێگایە گەل هەڵدەستێ بە هەڵبژاردنی دادوەران هەر وەکو چۆن ئەندامانی پەرلەمان هەڵدەبژێرن.

٢- لەگەڵ پرنسیپی (حوکمی گەل) دەگونجێت کە علمانیەکان بانگەشەی بۆ دەکەن: بۆیە بە پێی ئەم ڕێگایە ئەوە پەیوەنیەکی پتەو دروست دەبێت لە نێوان دادوەران وگەلدا.

٣- ئەگەر دادوەر خراب بوو لە کارەکەی ئەوە گەل دەتوانێ جارێکی تر هەڵینەبژێرێ: چونکە سیستەمی هەڵبژاردن لە زۆربەی وڵاتان چوار ساڵ جارێکە، واتا دادوەر هەتا چوار ساڵ لە پۆستەکەی دەمێنێتەوە پاشان دووبارە هەڵبژاردن ئەنجام دەدرێت، بۆیە ئەگەر دادوەرێکی باش نەبوو لە رابردودا ئەوە گەل دەتوانن جارێکی تر هەلینەبژێرنەوە.

**خراپەکانی ئەم ڕێگەیە:**

١- خودی پرۆسەی هەڵبژاردن خراپە بەم شێوەیەی ئەمڕۆ: زۆرێك لە زانایان رایان وایە کە پرۆسەی هەڵبژاردن بەم شێوەیەی کە لەم سەردەمە دەکرێ خراپە، بەڵێ لە ئیسلامدا هەڵبژاردن هەیە وە لەسەردەمی خەلیفە راشدیەکاندا هەڵبژاردن کراوە بۆ دیاریکردنی خەلیفەی موسوڵمانان بۆ نموونە هەڵبژاردنی (عمري کوري خطاب) و (عثماني کوري عفان) رەزای خوایان لێ بێت وەکو خلیفەی موسوڵمانان، بەلأم دەپرسین ئایە ئەو هەڵبژاردنە هەروەکو ئەوەی ئەم سەردەمە بوو؟ ئایە هەموو چین و لایەنەکانی ناو کۆمەڵگا بەشداریان پێ کرا لەو هەڵبژاردنە؟ ئایە کەسێك کە هێشتا هەرزەکارە یان کەسێکی پیر و پەککەوتە چی دەزانێ لە بەرەژەوەندی هەڵبژاردنی خلیفە؟ بۆیە لە وەڵامدا دەڵێم نەخێر وەکو یەك نین بەڵکو زۆریش جاوازن، ئەسڵەن لە ئیسلامدا لەو سەردەمەدا تەنها ئەوانە بۆیان هەبووە ڕای خۆیان بدەن وخەلیفە هەڵبژێرن کە پێیان دەوترێ (أهل الحل والعقد) وەکو زانایان و پیاو ماقولان و سەرۆك هۆزەکان و سەرۆکی سۆپاو .... هتد، بەڵێ ئەم چینانە دەزانن بەرژەوەندی مللەت لە چیدایە وە کێ باشە بۆ هەڵبژاردنی. بەلأم بەداخەوە هەڵبژاردن لەم سەردەمەدا لە لایەن هەموو کەسێکەوە ئەنجام دەدرێت تەنها ئەگەر تەمەنی لە (١٨) ساڵ زیاتر بێت، جا فەرق ناکا ئەو کەسە سەفیە و کەم عەقل و هەرزەکار و هیچ شتێك لە بەرژەوەندی وڵات و خەڵکی لە رووی دونیایی وقیامەتیەوە نەزانێ، تەنانەت جاری وا هەبووە کە بینیمانە لەم وڵاتەی خۆمان پیاو و ئافەرەتی ئەختیار و بەساڵاچووی وایان هێناوە بۆ هەڵبژاردن کە تەنانەت هیچ شتێك لە رۆژگاری ئەمرۆمان نازانێ. وە بەراستی ئەم بابەتە زۆر زیاتر هەڵدەگرێ و دەکرێ قسەی زیاتری لەسەر بکرێ.

**خراپەکانی ئەم ڕێگەیە:**

**١- خودی پرۆسەی هەڵبژاردن خرابە بەم شێوەیە.**

**٢- تزویر کردنی پرۆسەی هەڵبژاردن.**

**٣- ئەم ڕێگەیە وا دەکات کە ماوەی کاری دادوەری کەم وسنوردار بکات تەنها لە چوار ساڵدا.**

**٤- دادوەران بۆ ئەوەی جارێکی تر هەڵببژێردرێنەوە ئەوە بەڵێنی زۆر وناراست دەدەن بە جمهور.**

**٥- ڕۆڵی نفوذي ساسی.**

**٦- ڕۆڵی نفوذي ئابوری.**

**٢- دامەزراندنی دادوەران لە لایەن حکومەتەوە دەبەن واتە (تعيين القضاة من قبل الحكومة):**

**هەندێ لە ولاتانی جیهان لە نێوانیاندا فەرەنسا و زۆربەی ولاتە عەرەبیەکان بەرێگەی دامەزراندنی دادوەران لە لایەن حکومەتەوە دەبەن واتە (تعيين القضاة من قبل الحكومة).**

**باشەکانی ئەم ڕێگەیە:**

**أ- کاری دادوەری کارێکی پسپۆری وگرنگە بۆیە دەبێ بدرێتە دەست حکومەت.**

**ب- ئەم ڕێگەیە وا دەکات کە کاری دادوەری سنوردار نەکرێت بە چوار یان هەشت ساڵ.**

**ج- هەڵنەبژاردنەوەی دادوەر لەلایەن گەلەوە وا دەکات کاریگەری حزبە سیاسیەکان لەسەری کەمتر بێت.**

**خراپەکانی ئەم ڕێگەیە:**

**ئەم ڕێگەیە وا دەکات دەسەلأتی دادوەری سەربەخۆیی (دامەزراندن و بوجە و و و) خۆی لە دەست بدات.**

**٣- (اختيار المشترك ): واتە دیاریکردنی هاوبەش:**

**وە بەپێی ئەم ڕێگایە دەستەی دادوەری (الهيئة القضائية) هەڵدەستێت بە دیاریکردنی دادوەران لە نێوان ئەو تاکانەی کە دادگاکان تەرشیحیانی کردووە، بۆ نموونە // وڵاتی بەلجیکا ئەم ڕێگایە پەیرەو دەکات.**

**وە ئێمەش ئەم ڕێگایەمان پێ باشە بە بەراوەرد لەگەڵ ڕێگاکانی تر لەبەر دوو هۆ:**

**١- هەردوو ئەو لایەنەی کە ڕۆڵیان هەیە لە دیاریکردن و دامەزراندنی دادوەران بریتین لە لایەنی دادوەری، وە ئەوان باشتر دەزانن کێ لە فەرمانبەرەکانیان باشترە بۆ بوون بە دادوەر. هەروەکوو پەندێکی عەرەبی هەیە دەڵێت: أهل مكه أدرى بشعابها.**

**٢- لەم ڕێگەیە دادوەر دوور دەبێت لە کاریگەری حکومەت و حیزبە سیاسیەکان و خەڵکی، چونکە لەلایەن ئەوانەوە هەڵنابژێردرێت.**

**مەرجەکانی هەلبژاردنی دادوەر لە عیراق و هەریمی کوردستان:**

**لە عیراق ( وکوردستان پێشان ) دادوەر دادەمەزرا لە لایەن وەزارەتی دادەوە بەو مەرجانەی کە "عیراقی بێت بە ولادە، وە لەدایك و باوکێکی عیراقی بێ، وەژنی هێنابێت، ودەرچووی پەیمانگای دادوەری بێت (المعهد القضائي).**

وەلەشەرسعەتی ئیسلامیدا دادوەر لە لایەن خەلیفەوە دیاریدەکرێت پاش ئەوەی بە باشی لێی دەکۆڵدرێتەوە لە لایەنی دادپەروەری و زیرەکی کەسەکە.

پ/ مەرجەکانی دامەزراندنی دادوەر چییە لە هەرێمی کوردستانی عیراق؟ ولە لایەن کێ وە دادەمەزرێ؟

**دامەزراندنی دادوەران بە پێی یاسای پەیمانگەی دادوەری هەرێمی کوردستان– عێراق ژمارە (٧) ی ساڵی ٢٠٠٩:**

ماددەی (بیستەم)ی ئەم یاسایەدا ئاماژە بەوە دەکات کە هیچ قازییەك یان جێگرێکی داواکاری گشتی دانامەزرێ مەگەر لە پەیمانگەی بەرزی قازییەکان دەرچوو بێ، یان لەهەر پەیمانگەیەکی قەزائی هاوشانیدا لە عێراق دەرچووبێ. وە ماددەی (هەشتەم/ یەکەم) ی ئەم یاسایە ئاماژەی بەو مەرجانە کردووە کە پێویستە لەو کەسەدا هەبێت کە دەبێتە قوتابی لەم پەیمانگەیە و پاشان دەبێتە دادوەر، کە ئەمانەن:

١- پێویستە جنسییەی عێراقی هەبێت و شایانی تەواوی هەبێت.

٢- هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بە خوێندن و بە نووسین بە رەوانی بزانێت.

٣- پێویستە ڕەوشت و ناوبانگی باش بێت و بەجینایاتی دەسەتەئەنقەستی غەیرە سیاسی یان بە جونحەی ئابڕووبەر حکوم نەدرابێ و لەوەپێش لە پەیمانگە دەرنەکرابێ تەنیا مەگەر بە نەخۆشییەکی ناچاری و سەلمێنراو بەراپۆرتی لێژنەی پزیشکیی رەسمی لەبەر هۆی ناچاری.

٤- دەبێ لە هەموو ئەو نەخۆشی و کەمئەندامییانە سەلامەت بێ کە رێگەی ئیشەکەی لێ دەگرێ.

٥- دەبێ لە زانکۆیەکی عێراقی یان لە زانکۆیەکی بڕواپێکراوەوە بڕوانامەی بکالۆریۆسی وەدەست هێنابێ، بەمەرجێ خوێندنی تێدا رێك وپێك بێت و لە (باشە)ش کەمتر نەخەمڵێنرابێ.

٦- تەمەنی لە (٤٠) ساڵ زیاتر نەبێ.

٧– دەبێ بۆ ماوەی (٨) ساڵ بە کردار لە دەزگاکانی وەزارەتی داد، یان ئەنجومەنی دادوەری، یان دادگاکانی پەیوەست بەوان کاری کردبێ، یان بۆ ماوەی لایەنی کەم لە (٨) ساڵ کەمتر نەبێ پارێزەرایەتی کردبێ یان وەزیفەیەکی یاسایی لە دایەرەکان و بەرێوەبەرایە یاساییەکانی وەزارەت و دەزگا حکومیەکاندا کردبێ، بەمەرجێ هەر ساڵەی لانی کەم (٥) دەعوای گرتبێ، جا ئەوەی بڕوانامەی ماجستێری لە یاسادا هێنابێ (٢) دوو ساڵ لەو دوو ماوەیە بۆ دادەشکێ، ئەگەر بڕوانامەی دکتۆرای لە یاسادا هێنابێ (٥) پێنج ساڵی بۆ دادەشکێ، ئەو کارکردنەش بەر لەوەرگرتنی بڕوانامەکان بوو بێت یان پاش وەرگرتنیان هیچ فەرقی نییە.

٨- پێویستە حیزبی نەبێت یان سەر بەهیچ لایەنێکی سیاسی نەبێت، ئەگەر حیزبی بوو ئەوا پێویستە کاتێ بۆ پەیمانگەکە پێشکەش دەکات پەیوەندی خۆی بە حیزبەوە ببچڕێنێت.

٩- پێویستە لە تاقیکردنەوەی بە نووسین و بەزارەکیدا لەو یاسایەندا سەرکەوێت کە ئەنجومەنی پەیمانگەکە بڕیاری دەدات.

١٠- پێویستە لەو رووبەڕوو بوونەیەدا (مقابلە) سەرکەوێت کە ئەنجومەنی پەیمانگەکە لەگەڵی ئەنجامی دەدات.

بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسامی وتێبینی ئێمەیە ئەوەیە کە ماددەی (هەشتەم/ دووەم) لە هەمان یاسادا دەڵێت: (ئەو پارێزەرانەی لە پەیمانگاکە بۆ مەبەستی ئامادەکردن و شیاندن قوڵ کراون، لە حوکمەکانی بڕگەی (٧، ٨)ی (یەکەم)ی ئەم ماددەیە دەبووردرێن). کەواتە مەرجی حیزبی نەبوونی پارێزەرە کە دوای دوو ساڵ دەبێت بە دادوەر هەڵگرا و ئەوان

**ناگرێتەوە، وە دواتر دەبنە دادوەرێکی حیزبی و سەربەخۆیی دادگاکانیش دەکەونە ژێر پرسیارو مەترسیەوە.**

**وە ماددەی (هەژدەهەم) لە هەمان یاسادا ئاماژە بەوە دەکات کە دەرچووی پەیمانگە بەپێی فەرمانی (مرسوم)ی هەرێم دادەمەزرێ لە مەنسەبی قازی سنفی چوارەم یان جێگری داواکاری گشتی لە سنفی چوارەم.**

**پ/ مەرجەکانی دامەزراندنی دادوەر لە شەریعەتی ئیسلامیدا چییە؟**

**وەڵام: مەرجەکانی دامەزراندنی دادوەر لە شەریعەتی ئیسلامی ئەمانەن:**

١- ان يكون بالغاً عاقلاً ٢ .الاسلام

٣ . العدالة ٤. الاجتهاد.

٥. الذكور عند الجمهور. ٦. سلامة الحواس

**پ/ ئەرکەکانی دادوەر چییە؟**

**١- دادوەر دەبێ پارێزگاری لە هەیبەتی دادگا (قضاء) بکات، وە دوور بکەوێتەوە لە هەموو ئەو کارانەی کە گومان دروست دەکات لە راستگۆیی دادوەر.**

**٢- دادوەر دەبێ پارێزگاری لە نهێنی ناو دادگا و قەزا بکات و هەروەها هەموو ئەو زانیاری و بەلگانەی کە دێتە پێشی، وە ئەم واجبە بەردەوام دەبێت لە سەر دادوەر هەتاوەکو وازیش لەکارەکەی دەهێنی و دوای ئەویش.**

**٣- نابێ دادوەر کاری بازرگانی بکات یاخود هەرکارێکی تر کە ناگونجی لەگەل پیشەکەی.**

**٤- دادوەر دەبێ ماڵی بباتە ئەو شوێنەی کە جێگای کارەکەیەتی، تەنیا ئەگەر ئەنجومەنی دادوەری (مجلس القضاء) رێگەی پێدابی کە لە شوێنێکی تر نیشتەجێ بێت.**

**٥- دەبێت دادوەر جل و بەرگی یاسایی تایبەتی لەبەر بێت.**

**٦- نابێت دادوەر بەژداری بکات لە دەستەیەکی دادگایی کردن, ئەگەر هاتوو دادوەرێکی تێدابوو کە لە نێوانیاندا خزمایەتی هەبێ هەتا وەکو پلە چوار.**

**7- کارکردنی دادوەر لە ئیشی حیزبی قەدەغەیە، وە نابێ خوێ بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی یان دەستەکانی خۆجێیەتی یان رێکخراوی سیاسی بپاڵێوێ مەگەر لە دوای دەست لە کارکێشانەوەی بێت.**

**پ/ ئایا ئافرەت دەتوانێ ببێت بەدادوەر ؟**

**یەکەم: لە رووی یاساییەوە: هیچ مانع و رێگرییەك نییە کە ئافرەت ببێت بە دادوەر، چونکە ئەگەر تەماشای مەرجەکانی بوون بەدادوەر بکەین یان دامەزراندنی دادوەر (قاضی) بکەین کە یاسا دای ناوە ئەوە دەبینین جێبەجێ دەبێت لە سەر هەدوو رەگەزی نێر و مێ وەکو یەك، هەروەها هیچ بەندێکی یاسایی تایبەت و یەکلایی کەرەوەمان نییە کە ئافرەت مەنع کات لە کاری دادوەری، بەڵکو هەموو مەرج وبەندەکان بە شێوەی رەها (مطلق) هاتووە ورێسایەکمان هەیە کە دەڵێ: ((المطلق يجري على اطلاقه ما لم يقيد بقيد)). هەروەها لە زمانەوانیدا وشەی (قاضي) بە پیاو وئافرەت دەوترێت.**

**دووەم: لەرووی شەرعیەوە: سێ بۆچوون (رأی) هەیە کە ئەمانەن:**

**١- رأی جمهور: جمهوری زانایان (مەزهەبی شافعی ومالکی وحەنبلی) دەلێن بە هیچ جۆرێك ئافرەت بۆی نییە ببێت بە دادوەر.**

**٢- رأی مەزهەبی ئەبو حەنیفە: ئەبو حەنیفە دەلێ ئافرەت بۆی هەیە ببێت بە دادوەر لە هەموو داوایەك جگە لە داوای قصاص و حدود بۆی نییە بەژداری بکات.**

**٣- رأی ظاهري : زاهرێکان دەڵێن ئافرەت هەروەك پیاو بۆی هەیە ببێت بە دادوەر.**

**پ/ ئایا ئافرەت دەتوانێ ببێت بەدادوەر ؟**

**سێەم: لە ڕووی واقیعەوە: ئافرەت بۆی هەیە ببێت بە دادوەر، ولە کوردستانی خۆمان دادوەری ئافرەتمان هەیە لە شارەکانی سلێمانی و دهۆك هەولێر.**

**پ/ ئایە زاراوەی (قاضي) تەواوترە یان (حاکم)؟**

**زۆر جار تەنانەت کەسانی یاساییش نازانن جیاوازی چییە لە نێوان وشەی (قاضي) و (حاکم)، وە ئێمە وادەبینین کە زاراوەی (قاضي) تەواوترە بۆ بەکارهێنان لە رووی یاساییەوە، چونکە لە یاسای مرافعات و یاسای دەسەلآتی دادوەری ویاسای اصول المحاکمات الجزائیە العراقی زاراوەی (قاضي) بە کار هاتووە نەك (حاکم)، هەروەها بەپێی ماددەی یەکەم لە یاسای اصول المحاکمات الجزائیە العراقی کە هەموار کراوە بە بڕیاری (مجلس قیادة الثورة المنحل) ژمارە ٢١٨ لە ١٩٧٩/٢/٢٠ ئەوە زاراوەی (قاضي) جێگای زاراوەی (حاکم)ی گرتەوە، هەروەها لە شەریعەتی ئیسلامیدا زاراوەی (قاضي) بە کار دێت، ولە ولآتی ئەمریکا زاراوەی (حاکم) بۆ پۆستی ئیداری بەکاردێت، بۆ نموونە ئەکتەری بەناوبانگ (ئارنۆڵد) حاکمی ویلایەتی فلۆریدایە، وە (پۆل بریمەر) حاکمی مەدەنی عێراق بوو.**

**چوارەم: التقاضی علی درجتین : دادگایکردن بە دوو پلە:**

**ئەم خالە بە یەکێك لە بنەما سەرەکیەکانی سیستەمی دادگەری عیراقی دادەنرێت، وە بە پێی ئەم بنەمایە یەکەم جار داوا بەرز دەکرێتەوە بۆ دادگاکانی پلە یەك (محاکم الدرجە الاولی )، پاشان دۆڕاو یاخود حوکم دراو دەتوانێ رازی نەبێت بەو حوکمەی کە لە دژی دەرچووە وتانەی (طعن) لێ بگرێ و بەرزی کاتەوە بۆ دادگای پلە دوو یاخوود دادگای تێهەڵچونەوە، وەئەم دادگایە هەڵدەستێ بە سەیرکردنی کێشەکە سەر لە نوێ وەدەتوانێت حوکمێکی نوێ دەربکات و پێچەوانەی حوکمی دادگای پلەیەك بێت یاخود دەتوانێت هەندێك گۆڕانکاری لێ بکات.**

**پێنجەم: تعدد القضاة: فرە دادوەری:**

**یەکێکی تر لە بنەماکانی سیستەمی دادگەری زۆربەی ولاتان ئەوەیە کە دادگای پلە دوو وە دادگای بالآ لە چەند دادوەرێك پێکدێت نەوەك یەك دادوەر، بە واتایەکی تر کێشەکان لە لایەن دەستەیەك تەمەشا دەکرێت کە لە چەند دادوەرێك پێکهاتووە.**

**وەسیستەمی دادگەری لە عێراق بە بنەمای فرە دادوەری دەبات لە دادگاکانی جینایات و داگاکانی استئناف و**

**دادگای تەمیزە. بەڵام لە دادگاکانی پلە یەك – بە هەموو جۆرەکانییەوە جگە لە دادگای کارکێری نەبیٚ– بە بنەمای یەك دادوەری دەبات نەوەك فرەیی، وەئەمەش وادەگەیەنێت کەسیتەمی دادگەری لە عیراق لە هەردوو بنەمای فرە دادوەری ویەك دادوەر دەبات لە هەمان کاتدا، وئەم سیستەمەش لە مصر و فەرەنساش پەیرەو دەکرێت.**

**پرسیار / باشە و چاکەکانی یەك دادوەری چیە ؟**

**وەلام / ١. ئەم سیستەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە دادوەر هەست بە مەسئولیات و لێپرسینەوە بکات ئەمەش وادەکات دڵسۆز بێت لە کارەکەی.**

**٢– ئەم سیستەمە دەبێتە هۆی ئاسانکاری لە رێوشوێنی دادگایی کردن و تێچوی کەمی تیٚ بچێت.**

**پرسیار / باشە و چاکەکانی فرە دادوەری چیە ؟**

**وەلام / ١. ئەم سیستەمە وادەکات کە حوکمێکی عادل و دادپەروەر دەربچێت، چونکە ئەو کێشەیەی کە لە لایەن دەستەیەك لە دادوەران سەیردەکرێت ئەوا حوکمێکی باشترو نزیکتر لەراستی دەدەچیٚ.**

**٢–.ئەم سیستەمە وادەکات کە هەر دادوەرێك ببێتە چاودێر لەسەر ئەویتر کەئەمەش وادەکات دادوەران دووربن لەکاری گەنەلی و تەئسیری پیاوانی خاوەن دەسەلات.**

**شەشەم: مجانیة القضاء : دادگایکردن بەخۆڕاییە:**

**واتە خاوەن کێشەکان ( داواکار و داوالێکراو ) هیچ پارەیەك یاخود کرێیەك نادەن بە دادوەر لە بری حوکمدانی بەسەر کێشەکەیاندا، چونکە دادوەران هەڵدەستن بەم کارە لە بری مووچەیەك وەردەگرن لە حکومەت. بەڵام ئەمە ئەوە نا گەیەنێت کە خاوەن کێشەکان هیچ رەسمێك نادەن بە حوکمەت، بەڵکو پێویستە لەسەر داواکار (مدعی) ئەم رەسمانە بدات لە کاتی بەرز کردنەوەی داواکەی، بەڵام ئەگەر داواکەی بردەوە وداوالێکراو دۆڕا ئەوا پێویستە لەسەر داوالێکراو رسوماتی داواکە بدات.**

**وەئەگەر هاتوو داواکار نەیتوانی پارەی ئەو رسوماتانە بدات وداوایەکەی لایەنی بردنەوەی زاڵ بوو ئەوا لەم کاتەدا یاسا رێگەی داوە لەو رسوماتە (عفو) بکرێت بە شێوەیەکی کاتی، وئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو کەس یەکسانن بەرامبەر دادگا ودەتوانن لە هەموو کات و ساتێك داوای خۆیان بەرزکەنەوە.**

**حەفتەم: ضمانات صحة التقاضي: گرنتییەکانی ڕاستی دادگایی:**

**یاسا رێگا نادات کە تاکەکان بە دەستی خۆیان مافەکانیان وەربگرنەوە وە لە بری ئەمە مافی داوەتە هەموو تاکێك کەوا داواکانیان بەرز بکەنەوە بۆ لای دەوڵەت کە خۆی لە دادوەر دەگرێتەوە، وە ئەمە یەکێکە لە مافە گشتیەکان کە ناکریٚ بە هیچ جۆرێك تەنازولی لیٚ بکرێت، وە زۆربەی دەستور و پەیمانە نێودەوڵەتییەکان ئاماژەیان بەم خاڵە کردووە.**

**وە لەبەر گرنگی ئەم مافە ئەوا چەند زەوابت و بنەمایەك دانراوە کە گرنتی راستی دادگایکردن دەکات کە ئەمەش وادەکات تاکەکان هەست بە عەدالەت و راستی حوکمی دادگاکان بکەن.**

وە گرنتیەکانی راستی دادگایی ئەمانەن (ضمانات صحة التقاضي):

**گرنتی یەکەم/** عدم صلاحیة القاضي للقضاء:_نەگونجانی یاخوود نەبوونی دەسەلاتی دادوەر بۆ دادگاییکردن:

یاسادانەر(المشرع) بە ئامانجی بەدیهێنانی دادپەروەرییەکی تەواو ئەوا کۆمەڵێ هۆکاری داناوە کە ئەگەر هاتەجێ پێویستە لەسەر دادوەر واز بێنی لە سەیرکردنی ئەو داوایەی پێشی ئەمەش پێی دەوترێ ( تنحي القاضي )، هەروەها رێگەی داوە بە لایەنەکانی داوا (دعوا) کە داوای لادانی دادوەر بکەن لە سەیرکردنی داواکەیان کە ئەمەش پێی دەوترێت (رد القاضي).

یەکەم: تنحي القاضي:

واتە دادوەر بۆی نییە تەمەشای داوا بکات، وە ئەمەش لە دوو حالەت دەبێت:

حاڵەتی یەکەم : التنحی الوجوبی.

حاڵەتی دووەم : التنحی الجوازی.

حالەتی یەکەم: التنحی الوجوبی :

ماددەی (٩١) لە یاسای مرافعات الزامی (ناچاری) دادوەر دەکات کە سەیری دەعوا نەکات بە شێوەیەکی وجوبی لەم حالەتانەی خوارەوە:

**یەک/ خزمایەتی (القرابە) :**

ئەگەر هاتوو دادوەر مێردی یا زاوای یاخود خزمێکی هەتاوەکو پلە چوارەمی یەکێ لە لایەنە خاوەن کێشەکە بوو.

پ/ هۆکاری تەمەشا نەکردنی دادوەر لەم حاڵەتە بۆ چ دەگەرێتەوە؟

وەڵام:

١- دادوەر دەکەوێتە مەوقفێکی موحریجەوە چونکە ئەگەر حوکمی دەرکرد لە دژی خزمەکەی خۆی ئەوا شیرازەی کۆمەڵایەتی وخزمایەتی دادوەر تێکدەچێ و تورە دەبن لێی.

٢- وئەگەر هاتوو دادوەر حوکمی دەرکرد لە بەرژەوەندی خزمەکانی خۆی ئەوا لایەنەکەی تر هەست بە ستەم دەکات و وادەزانێت کە حوکمەکە دادپەروەر نییە.

**دوو / کێشە ( الخصومة) :**

ئەگەر هاتوو دادوەر یان خێزانی یاخود یەکێ لە مناڵەکانی یاخود باوك و دایکی کێشەیەکی بەردەوامی هەبێت لەگەڵ یەکێ لە لایەنەکانی داوا یا خێزانی یاخود یەکێك لە مناڵەکانی یا لەگەڵ باوك و دایکی.

پ/ هۆکاری تەمەشا نەکردنی دادوەر لەم حاڵەتە بۆ چ دەگەرێتەوە؟

وەڵام:

١- خودی هەبوونی کێشە وادەکات کە شك وگومان دروست بێت لە لای خەڵکی کەوا دادوەر نا دادپەروەرانە حوکم

**دەدات.**

**٢- پارێزگاری کردنی لایەنی بەرامبەر ئەگەر هاتوو دادوەر موتەئەسیر بوو بەم کێشەیە.**

**٣- پارێزگاری کردن لە دادوەر لە زارو زمانی خەڵکی بۆ ئەوەی نەڵێن دادوەر نا دادپەروەر بوو.**

**سێ/ سەرپەرشتیاری ( الاشراف):**

**ئەگەر هاتوو دادوەر بریکاری یا وەصی یاخود قەییمی یاخود میراتگری یەکێ لە لایەنەکان بوو، یاخود ئەگەر هاتوو دادوەر زاوای یا خزمی هەتاوەکو پلە چواری بریکاری یا وەصی یا قەییمی یەکێ لە لایەنەکان بوو.**

**چوار / بەرژەوەندی ( المصلحه) :**

**ئەگەر هاتوو دادوەر یا خێزانی یاخود یەکێ لە ئەصلەکانی (دایك و باوك) یاخود منالەکانی یاخود هاوسەری منالەکانی بەرژەوەندی هەبوو لەو دەعوایەی کە دادوەر سەیری دەکات، یاخود ئەو بەرژەوەندیە دەگەرایەوە بۆ کەسانێك کە دادوەر بریکارایەتی یاخود وەصیی یاخود قەییمی ئەو کەسەیە.**

**پێنج / رەئی دان ( إبداء الرأي):**

**ئەگەر هاتوو دادوەر فەتوای دابوو لە سەر داوایەك یاخود بەژداری کردبوو لە داوایەك بۆ بەرژەوەندی لایەنێك، یاخود ئەگەر هاتوو دادوەر پێش وەختە سەیری داوایەکی کردبوو وەکو دادوەر یا وەکو شارەزا (خبیر) یا وەکو ناوبژیوان وە یاخود شاهیدی لە سەر ئەو داوایە دابوو.**

**پ/ چ ئاسەوارێکی یاسایی دێتە کایەوە ئەگەر هاتوو دادوەر سەیری داوایەکی کرد سەرەرای بوونی ئەو هۆکارانەی لای سەرەوە؟**

**وەلام / ئەگەر هاتوو دادوەر گوێی نەدایە ئەم مەنعانەی لای سەرەوە وە سور بوو لەسەر سەیرکردنی داوایەکە یا حوکمی لەسەر دا ئەوا ئەسەرێکی یاسایی دێتە کایەوە ئەویش ئەوەیە: حوکمەکەی دادوەر فسخ دەبێت وە یاخود (نقض) دەکرێتەوە وە هەموو ئەو ئیجرائاتانەی کە کراوە بە باتڵ (باطل) دەژمێردرێت.**

**حالەتی دووەم: التنحي الجوازي: ماددەی ( ٩٤) لە قانون المرافعات المدنیە رێگەی داوە بە دادوەر دەست هەڵگری لە تەمەشاکردنی داوا ئەگەر هاتوو هەستی بە حەرەج و شەرمەزاری کرد لە سەیرکردنی ئەم داوایە، چونکە دەترسێ حوکمێکی دادپەروەرانە دەرنەکات، لەم حالەتەدا بۆی هەیە داوا لە سەرۆکی دادگا بکات رەزامەندی بفەرمێت لەسەر تەنەحی کردنی لە سەیرکردنی ئەو داوایە، وە سەرۆکی دادگا دەسەلأتێکی تەقدیری هەیە لەم حالەتەدا کە رازی بێت یاخود نا، وە ئەو ئاسەوارەی دێتە کایەوە لە ئەنجامی تەنەحی دادوەر ئەوەیە کە داوایەکە - کێشەکە- دادوەرێکی تر تەمەشای دەکات وە یاخود دەگوازرێتەوە بۆ دادگایەکی تر.**

**وە ئەو هۆکارانەی کە وا لە دادوەر دەکات کە هەست بە حەرەج و شەرمەزاری بکات دیارنەکراوە بە شێوەیەکی حەصر, چونکە ئەمە کارێکی شەخصیە دەگەرێتەوە بۆ خودی دادوەر. وە لەم هۆکارانەش بۆ نموونە: ئەگەر هاتوو**

یەکێ لە لایەنەکان برادەری خوێندنی دادوەر بوو، یا ئەگەر هاتوو دادوەر دراوسێیەکی کۆنی یەکێ لەلایەنەکان بوو .........هتد.

دووەم: رەد کردنی دادوەر (رد القاضي ):

واتە یەکێ لە لایەنەکانی دەعوا داوای مەنع کردنی ئەو دادوەرە دەکات لە سەیرکردنی دەعواکەیان لە بەر چەند هۆکارێك. وە ماددەی (٩٣) ی قانونی مرافعات ئەو هۆکارانەی دیاری کردووە ئەگەر هاتەدی ئەوا لایەنەکان بۆیان هەیە داوای (رد القاضي) بکەن.

هۆکارەکانی رد القاضی ئەمانەن:

١- ئەگەر هاتوو یەکێ لە لایەنەکان کاری دەکرد لە لای دادوەر یاخود ئەگەر دادوەر بە بەردەوامی دادەنیشت لەگەل یەکێ لە لایەنەکان یاخود ئەگەر دیاریەکی لێی وەرگرت لە پێش یاخود لە پاش بەرز کردنەوەی داواکە.

٢- ئەگەر هاتوو دادوەر دوژمنایەتی یاخود دۆستایەتی لەگەڵ یەکێ لە لایەنەکان هەبوو، کە ئەمەش وای دەکرد نەتوانێ حوکم بدات بە دادپەروەرانە.

٣- ئەگەر هاتوو دادوەر رەئیەکی پێش وەختەی دا بوو لەسەر کێشەکە کە ئەمەش وادەکات دادوەر لەسەر رەئیەکەی خۆی سوربێت.

إجراءات طلب الرد: رێ وشوێنی داوای رەد کردنی دادوەر

١- ئەو لایەنەی کە دەیەوێ دادوەر رەد بکاتەوە پێویستە عەریزەیەك بنوسێ بۆ سەرۆکی دادگا پێش ئەوەی دادوەر سەیری ناوەرۆکی داوایەکە بکات، وە ئاماژە بەو هۆکارە بکات کە بۆچی دادوەر رەد دەکاتەوە لە گەل بەڵگەکانی.

٢- پێویستە لە سەر دادوەر لە ماوەی سێ رۆژ وەلأمی ئەو عەریزەیە بداتەوە بە نوسراو.

٣- عەریزەی داواکار و وەلأمی دادوەر بەرز دەکرێتەوە بۆ بەرامبەر دادگای تەمییز کە بە شێوەیەکی بەپەلە تەمەشایان دەکات.

٤- ئەگەر دادگای تەمییز بریاری دا دادوەر دوور بکەوێتەوە لەو داوایەدا ئەوا دادوەرێکی تر دادەنرێت بۆ سەیرکردنی، بەلأم ئەگەر بریاری دادگای تەمییز لە بەرژەوەندی دادوەر بوو وە لە دژی ئەو لایەنە بوو کە عەریزەکەی بەرزکردۆتەوە ئەوا دادوەر بەردەوام دەبێت لە سەیرکردنی داوایەکە وەغەرامەش دخاتە سەر خاوەن عەریزەکە.

گرنتی دووەم: سکالأ کردن لە دادوەران (الشکوی من القضاة)

ماددەی (٢٨٦)) لە قانونی مرافعات رێگەی داوە بە لایەنەکانی داوا کە سکالأ - شکایەت- بکەن لە دادوەر یاخود لە دەستەی دادوەری لەم حالەتانەی خوارەوە:

١- ئەگەر هاتوو ئەوەی سکالای لێکراوە (دادوەر) غەش یا فروفێڵ یا هەڵەیەکی پیشەیی گەورەی کردبێ لەکاتی ئەنجامدانی وەزیفەکەیدا بە مەستی پشتگیری یاخود زەرەر لێدانی یەکێ لە لایەنەکان، بۆ نموونە: داوەر هەستا بە گۆرینی وتەی لایەنەکان یا شاهێدەکان یاخود هەندی بەڵگەکانی شاردەوە کە پێویست بوون لە کاتی حوکمداندا.

٢- ئەگەر هاتوو سکالأ لێکراو (دادوەر) سودێکی ماددی وەرگرتبێت بۆ ئەوەی یەکێ لە لایەنەکانی کێشەکەی خۆش بوێت وپشتگیری بکات.

**٣- ئەگەر دادوەر ئیمتناعی کرد لە جێبەجێ کردنی یا پەسەند کردنی حەق، (اذا امتنع القاضي عن احقاق الحق)، بۆ نموونە: ئەگەر دادوەر رازی نەبوو لەسەر وەلام دانەوەی عەریزەیەك پێشکەشی کرابوو بە بێ هیچ بیانویەك یاخود دوای بخات.**

**اجراءات الشكوى من القضاة: رێ و شوێنی سکالا کردن لە دادوەران**

**١- ئەو لایەنەی کە دەیەوێ سکالاٗ بکات لە دادوەر پێویستە عریزەیەك بنوسێ و واژووی بکات، خۆی یا بریکارەکەی، وە بەرزی بکاتەوە بۆ دادگای تێهەڵچونەوە (استئناف) یان دادگای تەمییز، وە پێویستە ئەو عەریزەیە کۆمەڵێ بەیاناتی لە خۆ گرتبێت وەك: ناوی سکالاٗکەر و کار و شوێنی نیشتەجێ و ناوی سکالا لێکراو(دادوەر) و ئەو دادگایەی کاری لێدەکات، وەهەروەها ئاماژە بەو هۆکارانە بکات کە بۆچی سکالاٗ لە دادوەر دەکات لەگەڵ بەڵگەکانی.**

**٢- دادوەر ئاگادار دەکرێتەوە لەو سکالاٗیەی کە لە دژی بەرزکراوەتەوە، وەپێویستە لەسەری (دادوەر) لە ماوەی (٨) رۆژ دا وەلامی ئەم عەریزەیە بداتەوە بە نوسراو، وەدەست هەڵگرێ لەسەیرکردنی داواکەی سکالاٗکەر.**

**٣- ئەگەر دادگای تێهەلچوونەوە یاخود تەمییز بریاریدا بە وەرنەگرتنی عەریزەی سکالاٗ یان سکالاٗکەر نەیتوانی سکالاٗیەکەی بسەلمێنێ ئەوا دادوەر بەردەوام دەبێت لە سەیرکردنی دەعواکە وە غەرامەش دەخاتە سەر سکالاکەر. بەلام ئەگەر هاتوو سکالاکەر توانی سکالاکەی بسەلمێنێ ئەوا دادگا بریار دەدات بە ئیلزام کردنی سکالاٗ لێکراو(دادوەر) کە قەرەبوی ئەو زەرەرە بکاتەوە کە توشی سکالاکەر هاتووە هەروەها ئاگاداری ئەنجومەنی دادوەری دەکاتەوە بۆ هەر رێوشوێنێکی یاسایی.**

**٤- دەتوانرێت (طعن) تانە بگێرێ لە بریاری دادگای تێهەلچوونەوە لەلای دەستەی گشتی (الهيئة العامة) لە دادگای تەمییز.**

**گرنتی سێیەم: دادگایکردن بە ئاشکرایە (علانية المرافعة):**

**ئەمە یەکێکە لە گرنتییە سەرەکییەکانی راستی دادگایکردن, وە لەبەر گرنگی ئەم خاڵە ئەوە ماددەی (١٩ / حەوتەم) لە دەستووری نوێی عیراقی بۆ ساڵی ٢٠٠٥ دەڵێ : "جلسات المحاكم علنية، إلاّ إذا قررت المحكمة جعلها سرية ".**

**هەروەها ماددەی (٦١) لە یاسای مرافەعاتی مەدەنی عیراقی دەڵێ: "تكون المرافعة علنية الاّ إذا رأت المحكمة من تلقاء نفسها أو بناءً على طلب أحد الخصوم إجرائها سراً محافظة على النظام العام أو مراعاة للآداب العامة ولحرمة الاسرة ".**

**هەروەها ماددەی (٧) لە یاسای دەستەلاٗتی دادوەری لە هەرێمی کوردستانی عیراق دەڵێ: "دانیشتنی دادگاکان ئاشکرایە، تەنها ئەگەر دادگا بڕیاریدا بە نهێنی بێت لەبەر رەچاوکردنی رەوشت و نیزامی گشتی یان بۆ رێزگرتن لە خێزان بە مەرجێك بڕیاری حوکمدان لە دانیشتنێکی ئاشکرا دەبێت".**

**وە لەم ماددانەی لای سەرەوە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە سیستەمی دادگەری عیراقی و کوردستانی چەند گرنگی داوە بە بنەمای دادگایکردن بە ئاشکرایی, وە ناوەڕۆکی ئەم بنەمایە ئەوەیە کە رێگە بدرێت بە جمهور متابەعەی داواکانیان بکەن و ئامادەی دانیشتنەکانی بن, وە ئەمەش وادەکات ببنە چاودێر لەسەر رێوشوێن و رەوشت و هەڵسوکەوتی دادوەر لە کاتی تەماشاکردنی داواکەیان, هەروەها ئەم بنەمایە ئەوە دەخوازێت کە مرافعەکردن بە**

زارەکی بێت نەك بە نوسراو.

**گرنتی چوارەم: گواستنەوەی داوا (نقل الدعوی):**

ماددەی (٩٧) لە قانونی مرافەعاتی مەدەنی عیراقی ڕێگەی داوە بە گواستنەوەی داوا لە دادگایەکەوە بۆ دادگایەکی تر بە بڕیاری دادگای تەمییز ئەگەر نەتوانرا دادگا تەشکیل بکرێ لەبەر هۆی یاسایی یان ئەگەر هاتوو تەماشاکردنی دەعواکە لەو دادگایە ئاسایشی ئەو شوێنەی تێکدەدا یاخود لەبەر هەر هۆیەکی تر کە دادگای تەمییز بڕیاری لەسەر بدات.

لەبەر ئەوەی نەصی ماددەکە بە شێوەیەکی ڕەها (مطلق) هاتووە ئەوا هەموو لایەنەکانی داوا بۆیان هەیە داوای گواستنەوەی داوا بکەن, وە هەر لایەنێکی ئیداری دەتوانێ لە ڕێگەی وەزارەتی دادەوە داوای گواستنەوەی داوا بکات.

**گرنتی پێنجەم: کۆمەکی دادوەری (المعونة القضائي):**

داواکار پێویستە هەندێك رسومات بدات بە دەوڵەت لەکاتی بەرزکردنەوەی داواکەی کە خۆی لە ڕێژەیەك پارە دەگرێتەوە وە قانون الرسوم العدلیە دیاری دەکات, بەلام ئەگەر هاتوو لایەنەکانی کێشەکە نەیانتوانی ئەم رسوماتانە بدەن ئەوا یاسادانەری عیراقی کۆمەکی یان یارمەتی بۆ داناون لە چوار یاسادا کە ئەمانەن:

ماددەی (٢٩٣- ٢٩٨) لە قانون المرافعات المدنیە.

ماددەی (٣١- ٣٣ ) لە قانون الرسوم العدلیە ژمارە (١١٤) بۆ ساڵی ١٩٨١.

ماددەی (٦٦- ٧٣ ) لە قانون المحاماة.

ماددەی (١٢٣-١٤٤ ) لە قانون اصول المحاکمات الجزائیە.

وتاکەکانی دەعوا دەتوانن داوای کۆمەکی دادوەری بکەن جا تاکێکی سروشتی بێت یان مەعنەوی, وەك جەمعییەی خێرخوازی کە منالە فەقیرەکان فێر بکات, بەلام پێویستە دوو مەرج بێتەدی لە تاکەکان تا کۆمەکی دادوەری بیانگرێتەوە:

١- قیام حالة الفقر: واتە ئەو کەسەی کە داوای کۆمەکی دەکات دەبێت هەژار بێت.

٢- إحتمال کسب الدعوی: واتە دەبێت ئەگەری بردنەوی داواکەی زۆر بێت.

وە ئەو ئیجرائاتانەی کە پێویستە بۆ وەرگرتنی کۆمەکی قەزایی ئەوەیە: داواکاری کۆمەکی دادوەری دەبێ عەریزەیەك بنوسێ وە بیدات بە دادگای تایبەت کە تەماشای داواکەی دەکات, وە دەبێت حاڵەتی هەژاری خۆی تەصدیق بکات لەلایەن ئەنجومەنی شارەوانییەوە یان هەر لایەنێکی تر, پاشان بڕیار دەردەچێت بە لێخۆشبوونی لەو رسوماتانە بە شێوەیەکی کاتی.

التقسيمات القضائية: دابەشكاريەتي دادگەري

پ/ مەبەست چييە لە دابەشكاري دادگەري؟

وەلآم: بە ماناي ريزبەندي و تەدەروج كردن لە دادگاكاني ولآت ديت وە بلآوبوونەوەيان بە شيوەيەكي ئاسۆي (أفوقي) لە يەكە كارگيرييەكاندا، هەروەها ريزبەندي لەو حوكم و بريارانەي كە لە دادگاكان دەردەچن بە شيوەيەكي ستوني (عەمەودي)، ئەمەش بەو واتايە ديت كە داوا يەكەمجار بەرزدەكريتەوە بۆ دادگاي پلە يەك پاشان حوكمدراو دەتوانيت تانە (طعن) بگريت و داواكەي بەرزكاتەوە بۆ دادگاي پلە دوو (دادگاي استئناف)، وە هەنديَ جار دەتوانيت تانە بگريت لەو حوكمە لە بەرامبەر دادگاي تەميز.

پ/سوودەكاني بنەماي ريزبەندي دادگايي چييە؟

وەلآم/ ١- لەوانەيە دادگاي پلە يەك هەڵە بكات لەو حوكمەي كە دەريكردووە بۆيە پێويست دەكات دادگايەكي بەرزتر تەماشاي بكاتەوە وە ئەو هەڵەيە چاك بكاتەوە كە لە حوكمەكەدا هەيە.

٢- ئەو دادگايەي كە حوكم دەردەكات دەزانيَ كە حوكمەكەي تەماشا دەكريتەوە لەلايەن دادگايەكي بەرزتر ئەوا هەوڵدەدات دادپەروەر و وردبين بێت.

پ/خراپەكاني ريزبەندي دادوەري چييە؟

وەلآم/ ئەم بنەمايە وادەكات كە يەكيَ لە لايەنەكاني دەعوا هەوڵي درەنگخستني وتاخير كردني داواكە بكات.

دادگاكان بە پێي گەورە و بچوكيان دابەشدەبن بۆ سيَ جۆر:

يەكەم: دادگا پلە يەكەكان (محاكم الدرجة الاولى):

دادگا پلە يەكەكان لە هەريمي كوردستاني عيراق ئەم دادگايانە دەگريتەوە:

١- محكمة البدائة: دادگاي بەرايي: لە مەڵبەندي هەر پاريزگايەك يان هەر قەزايەك دادگايەكي بەرايي دادەمەزريت، وە دەكريَ لە ناحييەكانيش بە بەياننامەيەك كە سەرۆكي ئەنجومەني دادوەري دەري دەكات پيك بهينريَ. وبۆي هەيە دەستەلاتي شويني دادگاكە بۆ زياتر لە قەزا يان ناحييەيەك فراوان بكاتەوە، وە ئەم دادگايە بە دادوەريك گريَ دەدريَ وە تەماشاي ئەو داوايانە دەكات كە دەكەونە چوارچيوەي تايبەتمەندييەكەيەوە.

٢- محكمة الاحوال الشخصية: المحكمة الشرعية: دادگاي باري كەسايەتي:

مادده (٢٥) لە ياساي دەستەلاتي دادوەري لە هەريمي كوردستاني عيراق ئاماژە بەوە دەكات كە دادگايەكي باري كەسايەتي يان زياتر لە هەر جيگايەك دادەمەزريَ كە دادگاي بەرايي ليَ بيت، وە دادوەري دادگاي بەرايي (موسلمان) بە دادوەري دادگاي باري كەسايەتي دادەنريَ ئەگەر دادوەري تايبەتي نەبيَ.

٣- محكمة العمل: دادگاي كار:

ماددەي (٣٠) لە هەمان ياسادا ئاماژە بەوە دەكات كە لە مەڵبەندي هەر پاريزگايەك دادگايەكي كار دادەمەزريت وە لە دادوەريك پيك ديت.

٤- محكمة المواد الشخصية: دادگاي ماددەكاني كەسايەتي:

ماددەی (٣٢) لە هەمان یاسا دەڵێ: لە مەڵبەندی هەر پارێزگایەك دادگایەك بۆ ماددەكانی كەسایەتی بۆ مەسیحییەكان و ئیزیدییەكان و ئایینەكانی تر پێك دەهێنرێت و بە یەك دادوەر دەبەسترێ، وە دەشێ لە مەڵبەندی قەزا وناحیەكانیش بە بەیاننامەیەكی سەرۆكی ئەنجومەنی دادوەری لە كاتی پێویستدا دابمەزرێ، هەروەها دادوەری دادگای بەرایی بە دادوەر لە دادگای ماددەكانی كەسایەتی دادەنرێت ئەگەر دادوەری تایبەتی نەبوو.

٥- القضاء الاداري: دادگای كارگێری:

ماددەی (١٢) لە یاسای ئەنجومەنی شوورای هەرێمی كوردستان - عیراق ژمارە (١٤) ی ساڵی ٢٠٠٨ ئاماژە بەوە دەكات كە وەزیری داد بۆی هەیە دادگای كارگێری لە سەنتەر پارێزگاكان لە هەرێم بە پێی پێویستی بەرژەوەندی گشتی دابمەزرێنێ، بە سەرۆكایەتی دادوەرێك لە پۆلی یەكەم و ئەندامێتی دوو دادوەر لە پۆلی دووەم یان سێیەم یاخود ئەندامێتی دادوەرێك و ڕوایژكارێك.

دووەم:دادگاكانی پلە دوو - دادگاكانی تێهەڵچونەوە: (محاكم الدرجة الثانية: محاكم الإستئناف):

ماددەی (١٤ / یەكەم) لە یاسای دەسەڵاتی دادوەری لە هەرێمی كوردستانی عیراق دەڵێ: دادگای تێهەڵچوونەوە دەستەی باڵای دادوەری دادگاكانی پارێزگایەك یان زیاترە، وە لە سەرۆك و چەند جێگرێكی سەرۆك و دادوەران پێك دێت.

هەروەها بڕگەی (دووەم) لە هەمان ماددە وە لە هەمان یاسادا دەڵێ: "دادگاكانی تێهەلچوونەوە بەم شێوەیە پێك دێت":

١- دادگای تێهەلچونەوەی ناوچەی هەولێر: دادگاكانی پارێزگای هەولێر دەگرێتەوە، وە ناوەندەكەی لە شاری هەولێر دەبێت.

٢- دادگای تێهەلچونەوەی ناوچەی دهۆك: دادگاكانی پارێزگای دهۆك دەگرێتەوە، وە مەلبەندەكەی لە شاری دهۆك دەبێت.

٣- دادگای تێهەلچونەوەی ناوچەی كەركوك: دادگاكانی ناوچەی كەركوك دەگرێتەوە، وە مەڵبەندەكەی لە شاری سلێمانی دەبێ بە شێوەیەكی كاتی.*-

٤- دادگای تێهەلچونەوەی ناوچەی سلێمانی: دادگاكانی ناوچەی سلێمانی دەگرێتەوە، وە مەلبەندەكەی لە ناوچەی سلێمانییە.

هەروەها ماددە (١٥) لە یاسای دەستەلاتی دادوەری دەلێت:

یەكەم: دادگای تێهەلچوونەوە و دەستەكانی بە سەرۆكایەتی سەرۆك یان یەكێك لە جێگرەكانی یان بە ئەندامییەتی دوو لە جێگرەكانی یان یەكێكیان وە دادوەرێكی دادگای تێهەلچوونەوە یان بە ئەندامییەتی دوو دادوەر لە دادوەرەانی دەبەسترێ.

دووەم: ناو نانی سەرۆك و ئەندامانی دادگای تێهەلچوونەوە بە بڕیاری ئەنجومەنی دادوەری دەبێت.

**سێیەم: دادگای پێداچوونەوە (محكمة التمييز):**

**دادگای پێداچوونەوە دەستەی باڵای دادوەرییە، چاودێری دادوەری بەسەر هەموو دادگا مەدەنییەکان لە هەرێمدا دەکات، بەلایەنی کەمەوە لە نۆ (٩) دادوەر پێکدێ کە سەرۆك و جێگرەکانی تێدایە وە بارەگاکەی لە هەولێری پایتەختی هەرێم دەبێ.**

**کارکردن لە دادگای تەمییز بە شێوەی دەستە دەبێت، وە دەستەکانی دادگای تەمیز ئەمانەن:**

**١- دەستەی گشتی: بە سەرۆکایەتی سەرۆکی دادگای تەمییز یان یەکێك لە جێگرەکانی یان کۆنترین دادوەر ئەگەر ئەوانە ئامادە نەبوون، یان بەربەستێکی یاساییان هاتەپێش بۆ بەشدار بوونیان دەبەسترێ بە ئەندامییەتی جێگرەکانی و هەموو دادوەران، وتایبەتمەند دەبێ بە بینینی ئەمانەی خوارەوە:**

**تایبەتمەندیەکانی دەستەی گشتی**

**١- ئەو داوایانەی حوکمی لە سێدارەدانیان پێدەرچووە.**

**٢- یەکلاکردنەوەی ئەو کێشەیەی لە ئەنجامی ناکۆکی نێوان حوکمەکان و بڕیارەکانی دادگای پێداچوونەوە روودەدەن.**

**٣- ئەوەی لە یەکێك لە دەستەکانی دیکەوە بۆی دەنێردریت، ئەگەر پاشگەزبوونەوەی لە پڕەنسیپێك دا بینی کە لە حوکمەکانی پێشوو بڕیاری لەسەردرا بوو.**

**٤- ئەوانەی یاساکانی تر دەیان گرێتەوە**

**دەستەی فراوان: بە سەرۆکایەتی سەرۆکی دادگای پێداچوونەوە یان کۆنترین جێگری یان کۆنترین دادوەر تێیدا لە کاتی ئامادە نەبوونیان یان بوونی بەربەستێکی یاسایی لە بەشدار نەبوونیان، دەبەسترێ بە ئەندامییەتی بە لایەنی کەم شەش لە دادوەران، وتایبەتمەند دەبێ بە بینینی ئەمانەی خوارەوە:**

**تایبەتمەندیەکانی دەستەی فراوان**

**١- بوونی ناکۆکی لەسەر جێبەجێ کردنی دوو حوکم کە پلەی بنبڕیان وەرگرتبێ و دژ بەیەك بن و سەبارت یەك بابەت دەرکرابن ئەگەر لە نێوان ناکۆکەکان خۆیاندا بێت یان یەکێکیان لایەن بێت لە دوو حوکمەکەدا و پەسەند کردنی یەك لەو حوکمانە و بڕیاردان لەسەر جێبەجێ کردنی بێ لەو حوکمەکەی تر، لەو بارەدا سەرۆکی دادگای پێداچوونەوە بۆی هەیە جێبەجێ کردنی ئەو دوو حوکمە دژ بەیەکە رابگرێ، تاکو بڕیاری پێداچونەوەی دەردەچێ.**

**٢- ئەو ناکۆکیەی دەکەوێتە نێوان دوو دادگا لەبارەی دەسنیشان کردنی تایبەتمەندی لەسەیر کردنی داواکە.**

**٣- ئەو حوکم و بڕیارانەی سەرۆك بۆی دەنێرێ تاکو لە چوارچێوەی تایبەتمەنی دادگا بڕیاری یەکلاکەرەوەیان لە بارەیەوە بدات بە پێی ئەو یاسایەی کە ئەو حوکم و بڕیارانەی پێ دەرچووە.**

**٣- دەستەی مەدەنی: تایبەتمەندە بە بینینی ئەو حوکم و بڕیارانەی کە لە داوا مەدەنییەکان و داوا جۆراوجۆرەکانی**

تر كە لە دادگاكان و لێژنەكانەوە بە پێی یاسا دەرچوون.
٤- دەستەی باری كەسایەتی: تایبەتمەندە بە بینینی ئەو حوكم و بڕیارانەی كە لە دادگاكانی باری كەسایەتی و ماددەكانی كەسایەتی بەپێی یاسا دەرچوون.
٥- دەستەی سزایی: تایبەتمەندە بە بینینی ئەو حوكم و بڕیارانەی كە لە داوا سزییەكانەوە بە پێی حوكمی یاسا دەرچوون.
٦- دەستەی كشتوكالی: تایبەتمەندە بە بینینی ئەو حوكم و بڕیارانەی كە لە لێژنەكانی زەوی و زار و دەست بەسەراگرتن دا دەرچوون.
٧- دەستەی (الاستئناف المدنی).
٨- دەستەی العمل.
٩- دەستەی المتفرقە.

دادگای دەستوری : (المحكمة الدستورية):
ماددەی (٩١) لە پرۆژەی دەستوری هەرێمی كوردستان - كە پەرلەمانی كوردستان - عیراق لە ٢٤/ ٦/ ٢٠٠٩ پەسەندی كردوە- ئاماژە بەوە دەكات كە بە یاسایەك دادگای دەستووری كوردستان-عێراق دادەمەزرێندرێت.

هەروەها ماددەی ماددەی (٩٢) لە هەمان پرۆژە ئاماژە بەوە دەكات كە:
یەكەم: دادگای دەستووری لە حەوت ئەندام پێكدێت بە سەرۆكەكەیەوە، كە لە نێو دادوەران و مامۆستایانی یاسا و پارێزەرانێكدا هەڵدەبژێردرێن كە سەرجەم كاركردنیان, لە بواری دادوەری, یان یاسادانان, یان وانە ووتنەوە یان پارێزەری, لە بیست ساڵ كەمتر نەبێ.
دووەم: سەرۆكی هەرێم بە ڕاوێژكردن لەگەڵ ئەنجومەنی دادوەری ئەندامانی دادگای دەستووری دەپالێوێ.
سێیەم: ئەندامانی دادگا پاش ئەوەی پەرلەمان بە زۆرینەی دوو لەسەر سێی ئەندامەكانی ڕەزامەندی لەسەر پالێوراوەكان دەردەبڕێ، بە مەرسومێك لەلایەن سەرۆكی هەرێمی كوردستانەوە دادەمەزرێن.
وە سەبارەت بە سەرۆكی دادگا ماددەی (٩٣) ئاماژە بەوە دەكات كە دادگا سەرۆكەكەی لە نێو ئەندامەكانیدا هەڵدەبژێرێ. وە بە پێی ماددەی (٩٤) سەرۆك و ئەندامانی دادگای دەستووری, پێش ئەوەی دەست بە ئەرك و فەرمانەكانیان بكەن, لەبەردەم سەرۆكی هەرێمی كوردستان سوێندی یاسایی دەخۆن.
وە ماددەی (٩٦) ئاماژە بەوە دەكات كە:
مەرجەكانی ئەندامەتیی لە دادگا و ڕەوتی كار تێداكردنیان وچۆنیەتی وەرگرتنی داواكاری و داخوازیەكان و تانووتەكان بە یاسایەك ڕێكدەخرێن.

إختصاص المحاكم: تایبەتمەندی دادگاكان
پ/ ئیختصاصی دادگاكان چییە و جۆرەكانی چین؟
وەڵام/ ئیختصاصی دادگا بە واتای ئەو دەستەڵاتە دێت كە یاسا بەخشیویەتی بە دادگا بۆ تەماشاكردنی داوایەكی

دیاریکراو وە حوکمدان بە سەریدا.

**وە جۆرەکانی ئەمانەن:**

**جۆری یەکەم: تایبەتمەندی دادوەری نێودەولەتی (الاختصاص القضائي الدولي).**

**جۆری دووەم: تایبەتمەندی وەلائی (الاختصاص الولائي او الوظيفي).**

**جۆری سێیەم: تایبەتمەندی النوعی (الاختصاص النوعي).**

**جۆری چوارەم: تایبەتمەندی شوێنی (الاختصاص المكاني).**

جۆری یەکەم: الإختصاص القضائي الدولي

واتە تایبەتمەندی دادگاکانی عیراقی لە سەر ئاستی نێودەوڵەتیدا، ئەمەش بۆ یەکلایکردنەوەی ئەو کێشانەی کە لە ناو خاکی عیراقی روو دەدەن وە داوالێکراو بیانییە (ئەجنەبییە)، یان داوا لێکراو عیراقییە وە سەرپێچییەکی کردووە لە دەرەوەی وولآت. وە ئەمەش لە ماددەی (١٤و١٥) ی یاسای مەدەنی عیراقی باسکراوە لە دوو حالەتدا:

حاڵەتی یەکەم: المدعى عليه عراقى: داوا لێکراو عیراقییە:

ماددەی (١٤) لە یاسای مەدەنی عیراقی دەلێ: "هەر تاکێکی عیراقی دادگایی دەکرێت لە بەرامبەر دادگاکانی عیراقی لەسەر ئەو ماف و ئەرکانەی کە دێنە سەر ئەستۆی لە دەرەوەی عیراق"

حالەتی دووەم: المدعي عليه أجنبي: داوا لێکراو بیانییە:

هەر ئەجنەبییەك لە بەرامبەر دادگاکانی عیراقی دادگایی دەکرێت لەم حالەتانەی خوارەوە:

١. ئەگەر تاکە ئەجنەبییەکە لە عیراق بوو: ئەوە داواکە بەرزدەکرێتەوە لە دژی لەو دادگایەی کە شوێنی نیشتەجێ بوونی لێیەتی، یان لە دادگای شوێنی عەقارەکە بە مەرجێك ئەگەر عەقارەکە لە عیراق بێت.

٢. ئەگەر هاتوو بابەتی داواکە عەقار بوو وە لە عیراقیش بوو، یان مەنقول بوو وە لە عیراق بوو لە کاتی بەرزکردنەوەی داواکە: وە ئەو داوایەی کە بابەتەکەی عەقارە ئەوە داواکە لە دادگای شوێنی بوونی عەقارەکە بەرز دەکرێتەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو بابەتەکە مەنقولْ بوو ئەوا داواکە بەرزدەکرێتەوە لە دادگای شوێنی نیشتەجێبوونی داوالێکراو، یان مەلبەندی معامەلاتی، یان شوێنی دروستبوونی التزامەکە، یان شوێنی جێبەجێکردنی التزامەکە، یان ئەو شوێنەی کە هەردوو لایەن لە سەری رێککەوتوون بۆ بەرزکردنەوەی داواکە.

٣. ئەگەر هاتوو بابەتی دەعواکە عەقدێك – گرێبەستێك– بوو کە لە عیراق بەسترا بوو، یان لە دەرەوەی عیراق بەسترا بوو بەڵام جێبەجێ کردنەکەی لە عیراق بوو، یان بابەتی داواکە دەگەڕایەوە بۆ ڕووداوێك کە لە عیراق روویداوە.

جۆری دووەم: الإختصاص الولائي او الوظيفي

ماددەی (٢٩) لە قانونی مرافەعاتی مەدەنی دەڵێ: دەسەڵاتی دادگای شارستانی جێبەجێ دەکرێت بەسەر هەموو کەسێکی سروشتی و معنوی، هەروەها حکومەتیش، وتایبەتمەندە بە تەمەشاکردنی هەموو کێشەکان إلاّ مەگەر یاسایەکی تایبەت ئیستیسنای چەند حالەتێکی دیاری کراو بکات.

وە ئەو حاڵەتانەی کە ئیستیسنا کراون ئەمانەن:

**ئەو حاڵەتانی کە دادگاکان ناتوانن تەمەشایان بکەن:**

**١- کارەکانی سەروەری (اعمال السیادە):** واتە دادگا تەماشای ئەو کارانە ناکات کە بە کاری سەروەری دادەنرێت. هەروەکو لە ماددەی (١٠) لە یاسای **التنظیم القضائي عيراقي** هاتوە. وە لە کوردستان ئەو کارانە دەگرێتەوە کە بە دەسەڵاتەکانی سەرۆکی هەرێم دادەنرێ هەروەکو لە ماددەی (دەیەم) لە یاسای سەرۆکایەتی هەرێم ژمارە (١) ی ساڵی ٢٠٠٥ کە خۆی لە هەژدە کار دەگرێتەوە.

**پ/ کارەکانی سەروەری چی یە؟**

وەڵام: ١- دادگای تەمییزی عێراقی پێناسەی کارەکانی سەروەری کردوە بەوەی ئەو کارانەیە کە لە حکومەتەوە دەردەچێت بە سیفەتی دەسەڵاتی حکومران نەوەك بەسیفەتی دەسەڵاتی کارگێری بۆ پارێزگاری کردن لە کیانی دەوڵەت.

**پ/ ئایە حکومەتی عیراقی کارەکانی سەروەری پێ بەخشراوە؟**

وەڵام: بەڵێ ئێمە وا دەبینین پێی بەخشراوە، بۆیە دادگا ناتوانێ تەمەشای ئەو کێشانە بکات کە پەیوەندیدارە بە حکومەتی فیدرالی عێراقی وە بە کاری سەروەری دادەنرێ، هەروەکو لە ماددەی (١٠) لە یاسای **التنظيم القضائي عيراقي** هاتوە کە دەڵێ: (**لا ينظر القضاء في كل ما يعتبر من اعمال السيادة**)، بەڵام جگە لە داوای أعمال السيادە ئەوە هیچ حەصانەیەکی دادوەری پێی نەبەخشراوە.

**پ/ ئایە حکومەتی هەرێمی کوردستان کارەکانی سەروەری پێ بەخشراوە؟**

وەڵام: نەخێر ئێمە وا دەبینین کە پێی نەبەخشراوە، هەر بۆیە دادگا دەتوانێ تەمەشای هەموو ئەو کێشانە بکات کە پەیوەندیدارە بە حکومەتی هەرێمی کوردستان- عێراقی، چونکە لە یاساکانی کوردستان هیچ ئاماژەیەك نەکراوە بە کاری سەروەری لەلایەن حکومەتەوە، هەروەکو لە ماددەی (٥) لە یاسای **السلطة القضائية لاقليم كوردستان ٢٠٠٧** هاتوە کە دەڵێ:(دادگاکان دەستەڵاتیان بەسەر هەموو کەسێکی سروشتی و مەعنەویدا هەیە، تا دەگاتە حکومەتیش و تایبەتمەندە بە یەکلاکردنەوەی هەموو کێشە و تاوانەکان ).

**پ/ ئایە سەرۆکی هەرێم هیچ کارێکی هەیە کە بە کاری سەروەری هەژمار بکرێ و حەصانی دادوەری هەبێ تیایدا؟**

وەڵام: بەڵێ هەیەتی، یاسای ئەنجومەنی شورای هەرێمی کوردستانی عیراق ژمارە (٢٥) بۆ ساڵی ٢٠٠٨ لە مادەی (١٦) دەڵێ: دادگای کارگێری تایبەتمەند نی یە بە تەماشاکردنی ئەمانەی خوارەوە: (١- کارەکانی سەروەری: کە ئەمەش ئەو کارانە دەگرێتەوە کە بە دەسەڵاتەکانی سەرۆکی هەرێم دادەنرێ هەروەکو لە ماددەی (دەیەم) لە یاسای سەرۆکایەتی هەرێم ژمارە (١) ی ساڵی ٢٠٠٥ کە خۆی لە نۆزدە کار دەگرێتەوە. بەڵام ئەم حصانەیە دادگاکانی تر ناگرێتەوە وەکو دادگای جنایات یاخود بەرایی ... هتد.

**٢- ئەو داوايانەی كە لەسەر ديبلۆماتكارەكان بەرز دەكرێتەوە، (الدعاوى المقامه على الدبلوماسيين ):**
**ماددەی يەكەم لە قانون (امتيازات المميلين السياسين العراق) ژمارە (٤) بۆ ساڵی ١٩٣٥، هەروەها ماددەی (٣) لە رێككەوتنامەی ڤيەننا بۆ پەيوەندی ديبلۆماسی بۆ سالی ١٩٦١ ئاماژەيان بەوە كردووە كە ديبلۆماتكاران حەسانەی دادوەريان هەيە بەرامبەر بە دادگاكانی عيراق جگە لە هەندێك حاڵەت نەبێ كە ئەمانەی خوارەوەن:**

**ئەو حالەتانەی كە ديبلۆماتكاران حەسانەيان نامێنێ:**
**أ- ئەو داوا عەينيانەی كە پەيوەندييان هەيە بە مافێكی عەقاری وە دەكەوێتە ئەو دەوڵەتەی كە ديبلۆماتكارەكە لێيەتی.**
**ب- ئەو داوايانەی كە پەيوەنديان هەيە بە ميرات، وە ديبلۆماتكارەكە بەشداری لەو ميراتە دەكات وەكو جێبەجێ كار يان وەكو ميراتگر يان وەسيەت بۆ كراو، بە سيفەتی ئەسڵی لەسەر خۆی نەك بە سيفەتی بريكاری لەسەر دەوڵەتی خۆی.**
**ج- ئەو داوايانەی كە پەيوەندييان هەيە بە هەر چالاكييەكی پيشەيی يان بازرگانی كە ئەنجامی دەدات لەو دەوڵەتەی كە تيايدايە لە دەرەوەی كاری فەرمی خۆی.**

**٣- ئەو كاتەی كە ياسا ئاماژە بەوە دەكات كە دادگاكان تەماشای جۆرە داوايەكی دياريكراو ناكەن: بـــــۆ نمـــونـــە:**
**أ- ئەو داوايانەی كە پەيوەندييان هەيە بە جێبەجێ كردنی ياسای خدمەی مەدەنی.** (تنص الفقرة الاولى من المادة (59) من قانون الخدمة المدنية رقم (24) لسنة (1960) المعدل على انه لا تسمع المحاكم الدعاوي التي يقيمها الموظف أو المستخدم الذي يدعي بحقوق نشأت من هذا القانون أو بموجب قانون الخدمة المدنية رقم (55) لسنة (1956) أو تعديلاته أو أي نظام صدر بموجبها بل يكون البت في مثل هذه القضايا وما يتفرع في مجلس الانضباط العام، ولهذا فان المحاكم تحكم برد الدعوى في مثل هذه ألاحوال.).
**ب- ئەو داوايانەی كە پەيوەندييان هەيە بە ياسای رێكخستنی بازرگانی.** (نصت المادة (26) من قانون تنظيم التجارة العراقي رقم (20) لسنة (1970) المعدل على أنه لا تسمع الدعاوي في المحاكم ضد الحكومة أو (مجلس تنظيم التجارة ) أو (الوزير المختص أو من يخوله أو الهيئة) الهيئة المختصة بالتحقيق والاشراف أو أية لجنة أخرى مؤلفة وفقاً لهذا القانون عن أي عمل قامت به تنفيذاً لاحكامة).

**ج- ئەو داوايانەی پەيوەنديان هەيە بە ياسای وەزارەتی خوێندی باڵا وتوێژينەوەی زانستی: ماددەی (٤٦) لە ياسای وەزارەتی خوێندنی باڵا وتوێژينەوەی زانستی ژمارە (١٠) بۆ ساڵی ٢٠٠٨ ئاماژە بەوە دەكات كە: (تەنها زاكۆ و دەستە تايبەتمەندن بە يەكلايی كردنەوەی سكاڵاكانی كە پەيوەنديدارن بە قبوڵ و گواستنەوە و ئەزموونەكان و سزا بەرزەفتەيەكان كە بەسەر قوتابيدا دەسەپێ وە فەسڵ كردنيان بە هۆی دەرنەچونيان لەگەڵ هەڵسەنگاندنی بڕوانامەكان پلە زانستيە عێراقی و بيانيەكان كە لە دوای قۆناغی خوێندنی دواناوەندی دێن لەگەڵ داواكاری بەخشينی نازناو و بڕوانامەی زانستی و فەخری.**

**پ/ ئایە ئیختصاصی ولائی لە نیزامی عامدایە؟ وە بەواتی چی دێت؟**

**وەڵام: ئیختصاصی ولائی لە نیزامی عامدایە، ئەمەش دوو مانە دەگەیەنێت:**

**١- ناتوانرێت موخالەفەی ئەو شتە بکرێت کە لە نیزامی عامدا بێت.**

**٢- دادگا سەربەخۆ ئەو بابەتە پەیڕەو و ئیسارەی دەکات وە جیٚ بەجێی دەکات.**

**پ/ ئایە سەرۆك کۆماری عێراق حصانەی قضائي هەیە؟**

**نەخێر نیەتی : في ظل الدستور العراقي الصادر عام ٢٠٠٥ فلم نجد ما يشير الى حصانة رئيس الجمهورية من احكام القانون الجنائي العراقي، غير ان المشرع الدستوري قد افرد اجراءات خاصة لمسائلة الرئيس واعفائه من منصبه من خلال مجلس النواب اذا ما ثبتت ادانته من المحكمة الا تحادية العليا في احد الجرائم الاتية (الحنث باليمين الدستورية، انتهاك الدستور. الخيانة العضمى ) م/ ٥٨/ سادسا.**

**پ/ ئایە سەرۆك وەزیرانی عێراق حصانەی قضائي هەیە؟**

**جگە لە داوای أعمال السيادە ئەوە هیچ حەصانەیەکی دادوەری پێی نەبەخشراوە. : مادة ٨٣ من الدستور : تكون مسؤولية رئيس مجلس الوزراء والوزراء امام مجلس النواب تضامنية وشخصية .**

**پ/ ئایە سەرۆکی هەرێمی کوردستان حصانەی قضائي هەیە؟**

**پ/ ئایە سەرۆك وەزیرانی کوردستان حصانەی قضائي هەیە؟**

**نەخێر نیەتی: بەپێی قانون مجلس وزراء اقليم كوردستان العراق رقم ( ٣ ) لسنة / ١٩٩٢**

**پ/ ئایە ئەندام پەرلەمانی عێراق حصانەی قضائي هەیە؟**

**بەڵی هەیەتی بە پێی ماددەی (٦٣) ی دەستوری عیراقی و ماددەی (٢٠)ی سیستەمی ناوخۆی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق.**

**پ/ ئایە ئەندام پەرلەمانی کوردستان حصانەی قضائي هەیە؟**

**بەڵی هەیەتی بە پێی مادە ٢٦ لە سیستەمی ناوخۆی بەرلەمانی کوردستان:**

**لا يسأل العضو عما يبديه من اراء او ما يورده من وقائع اثناء ممارسة عمله في المجلس.**

**وة مادة ٢٧**

**١ – لا يجوز ملاحقة اي من الاعضاء او القاء القبض عليه بسبب جريمة اثناء دورات الانعقاد دون اذن المجلس الا في حالة التلبس بجناية.**

**٢ – لا يجوز ملاحقة اي من الاعضاء او القاء القبض عليه خارج دورات الانعقاد بسبب جريمة بدون اذن من رئيس المجلس الا في حالة التلبس بجناية.**

**٣ – يقدم الطلب بالاذن الى الرئيس من الجهة القضائية المعنية، مشفوعا باوراق القضية المطلوب اتخاذ الاجراءات فيها.**

٤ – يدرج الرئيس الطلب المذكور في جدول اعمال اقرب جلسة ويعرضه على المجلس للبت فيه في الحالات الواردة في الفقرة " ١ " من هذه المادة.
٥ - لا ينظر المجلس في هذا الطلب من حيث توافر ادلة التهمة او عدم توافرها وانما ينظر في جدية الدعوى، لتحقيق العدالة او كيديتها بقصد الاساءة للعضو.

پ/ ئایە وەزیر حصانەی هەیە وە چۆن دادگایی دەکرێ؟
نەخێر نیەتی بەپێی قانون مجلس وزراء اقليم كوردستان العراق رقم ( ٣ ) لسنة / ١٩٩٢

جۆری سێیەم : ئیختصاصی جۆری (الإختصاص النوعي)
مەبەست لەم ئیختصاصە ئەوەیە: دەسەڵاتی دادگا لە تەماشا کردنی جۆرێکی دیاریکراو لە داوا، وە ئەم ئیختصاصەش لە نیزامی عامدایە، وە لە خوارەوە باس لە ئیختصاصی نەوعی هەموو پلە دادگاکانی عیراقی دەکەین:
الإختصاص النوعي لمحاكم الدرجة الاولى:
ئیختصاصی جۆری دادگاکانی پلە یەك
یەکەم: دادگای بەرایی (محكمة البدائة):
ئەو داوایانەی کە ئەم دادگایە تەماشایان دەکات هەندێکیان قبوڵی تەمییز دەکات لەلای دادگای ئیستئناف بە سیفەتی تەمیزی، واتە ناکرێ تانەی لێ بگیرێ بە ڕێگەی ئیستیئناف، وە هەندێکی تریان قبولی تانە دەکەن بە هەردوو ڕێگەی ئیستیئناف و ڕێگەی تەمییز لە لای دادگای تەمیز، وئێستاش باس لە هەردوو حاڵەت دەکەین:

حاڵەتی یەکەم:
ئەو داوایانەی کە دادگای بەرایی تەماشایان دەکات بە پلەی کۆتایی بدرجه أخيره- کە دەکرێ تەمییز بکرێنەوە لەلایەن دادگای ئیستیئناف بە سیفەتی تەمییزی ئەمانەن:
١- داوای مەنقول و قەرز هەتا (٥٠٠) دینار، بەڵام ئەگەر هاتوو لە نێوان (٥٠٠-١٠٠٠) دینار بوو ئەوا ئیستیئناف ناکرێ بەڵکو تەنیا تەمییز دەکرێ لەلای دادگای تەمییز.
٢- داوای قستی ئەو قەرزانەی کە بەهاکەی دەگاتە (٥٠٠) دینار.
٣- داوای نەهێشتنی شیوع لە عەقار یان لە مەنقول.
٤- داوای چۆلکردنی بەکرێدراو هەرچەند بێ بەهای کرێکە.
٥- داوای حیازە – بندەستانە.
٦- ئەو داوایانەی کە پەیوەندییان هەیە بەو رسوماتانەی کە بەهاکەیان دیاریکراوە یان دیارینەکراوە.
٧- ئەو بابەتانەی کە مەترسیان لێ دەکرێ بە تێپەڕ بوونی کات کە ئەمەش (قضاء المستعجل، حجز الاحتياطي، قضاء الولائي) دەگرێتەوە.
٨- ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان هەیە بە دەست بەسەراگرتن بەسەر ئەو قەرزارانەی کە ئیفلاسیان کردووە.
٩- دەرچوونی دابەشکەری سیستەمی - القسامات النظامية- کە پەیوەندیان هەیە بە گواستنەوەی مافەکانی زەوی

و زاری دەوڵەت بە پێی ماددەکانی (١٨٧-١٩٩) لە یاسای مەدەنی عیراقی.

١٠- داوای ئیستملاك (دەست بەسەراگرتن و بوونە موڵكی دەوڵەت).

١١- داوای جێبەجێ کردنی ئەحکامی ئەجنەبی.

١٢- داوای باری مەدەنییەکان وەکو راست کردنەوەی ناو یان تەمەن.

١٣- هەر داوایەکی تر کە یاسا ئاماژەی پێ بکات کە لە ئیختصاصی دادگای بەراییە.

**حاڵەتی دووەم:**

ئەو داوایانەی کە دادگای بەرایی تەماشایان دەکات بە پلەی یەکەم - بدرجه اولی- کە دەکرێ ئیستیئناف و تەمییز بکرێنەوە:

١- ئەو داوایانەی کە بەهاکەیان لە هەزار دینار زیاترە.

٢- داوای ئیفلاس وە ئەوەی پەیوەندی پێوە هەیە بە پێی یاسای بازرگانی.

٣- داوای پاکتاوکردنی کۆمپانیاکان - تصفیه الشرکات- بە پێی ئەحکامی یاسای کۆمپانیاکان.

**دووەم: دادگای کار (محكمة العمل):**

ئەو داوایانەی کە دادگای کار تەماشایان دەکات ئەمانەن:

١- ئەو داواو کێشە مەدەنی و جەزائییانەی کە ئاماژەیان پێ کراوە لە یاسای کار وە لە یاسای التقاعد والضمان الاجتماعي للعمال.

٢- ئەو بڕیارە کاتییانەی کە پەیوەندیان هەیە بەو داوایانەی کە دەچنە ژێر اختصاصی ئەم دادگایە.

٣- هەر داوا و بابەتێکی تر کە یاساکان ئاماژەی پێ بکات کە لە اختصاصی دادگای کارە.

**سێیەم: دادگای باری کەسایەتی (محكمة الأحوال الشخصية):**

ئەم دادگایە سەیری ئەو داویانەی خوارەوە دەکات :

١- هاوسەرگیری (عقد الزواج) و هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندیان پێوە هەیە لە مارەیی و نەفەقە و نەسەب و حضانە و گلاق و.....هتد.

٢- دانان و لابردنی سەرپەرشتیار لەسەر (وقفي ذري) هەروەها لێپرسینەوەیان و ترشیح کردنی متوەلی لە وەقفی خیری و مشترك.

٣- حجرکردن لەسەر کەم عەقلان (شێت ) وە لابردنی ئەو حجرە وە سەلماندنی بالغ بوون.

٤- سەلماندنی مردن و دابەش کردنی میرات.

٥- بابەتی مەفقود وە ئەوەی پەیوەندی پێوە هەیە.

٦- ئەو بابەتە شەرعیانەی کە سیفەتی پەلەیان هەیە وەکو نەفەقەی کاتی.

٧- بابەتی گۆڕینی دین لە غەیری ئیسلامەوە بۆ ئیسلام، بەڵام گۆڕینی دین لە ئیسلامەوە بۆ غەیری ئیسلام نابێت وە جائیز نیە.

٨- داوای کرێی پارێزەر و مەسروفاتی ئەو داوایانەی کە ئەم دادگایە تەماشایان دەکات.

٩- دەرچواندنی بەڵگەی مردن (حجج الوفاة) وە بەڵگەی لە دایك بوون بۆ ئەو منالأنەی کە دایك و باوکیان دیارە یاخود نادیارە یاخود یەکێکیان نادیارە.

١٠- دەرچواندنی بەڵگەی رێگەپێدان بۆ ژن هێنان لە ژنی دووەم یاخود سێیەم یاخود چوارەم (اصدار حجة الاذن بالزواج).

چوارەم: دادگای موادی کەسایەتی (محكمة المواد الشخصية ):

١- ئەو داوایانەی کە پەیوەندیان هەیە بە هاوسەرگیری و مارەیی و تەلاق هتد.

٢- داوای حضانة (لە ئامێزگرتن).

٣- ئەو بابەتانەی کە پەیوەندیان هەیە بە نەسەب.

٤- داوای نەفەقە (بژێوی) بۆ ژن یان منداڵ یاخود بۆ دایك و باوك و خزم و کەس.

٥-ئەو داوایانەی کە پەیوەندیان هەیە بە میرات و وەسیەت و دەرچواندنی دابەش کەری میرات.

٦- داوای وەقف و دانان و لابردنی سەرپەرشتیار واتە متوەلی.

٧- ئەو داوایانەی کە پەیوەندیان هەیە بە دانان و لابردنی وەصی و قەییم و دانانی حجر بەسەر شێت و غائب.

٨- ئەو بابەتانەی کە پەیوەندیان هەیە بە حجر واتە رێگە نەدان و رێگە دان لە بابەتی باری کەسیەتی.

٩- داواکانی دادوەری بەپەلە (القضاء المستعجل) لە بابەتی باری کەسایەتی وەکو نەفەقەی کاتی.

پێنجەم: دادگای کارگێری (المحكمة الادارية):

ئەم دادگایە تایبەتمەندە بە بینینی ئەم داوایانەی خوارەوە:

١- سەیرکردنی دروستی ئەو فەرمان و بڕیارە کارگێڕیانەی کە لە فەرمانبەران و دەستەکان لە فەرمانگەکانی هەرێم دەردەچن لە دوای بەرکاربوونی یاسای ئەنجومەنی شورای هەرێمی کوردستان.

٢- یەکلاکردنەوەی ئەو تانە (طعن) تایبەتییانەی بە هەڵبژاردنی دەستەی خۆجێیەکان (الهيئات المحليه).

٣- یەکلاکردنەوەی ئەو داوایانەی کە دەستەکان و کەسەکان پێشکەشی دەکەن بۆ هەڵوەشاندنەوەی بڕیارە کارگێرییە کۆتاییەکان.

٤- داواکانی رەگەزنامە.

٥- داواکانی قەرەبووکردنەوە لەو زینانەی کە لە ئەنجامی بڕیارە کارگێڕییەکانی بە نا یاسایی دەرچوون.

٦- تانەدان لە بڕیارە کۆتاییەکانی کە لە لایەنە کارگێڕییەکانەوە دەرچوون لە بارەی کێشەکانی باج و رەسم بە پێی ئەو یاسایەی کە چۆنیەتی سەیرکردنی ئەو ناکۆکیانە رێك دەخات.

٧- تانەدان لە رەتکردنەوەی یان کار نەکردنی فەرمانبەر یان دەستەی فەرمانگەکان و دەزگاکانی هەرێم لە بارەی دەرکردنی بڕیارێك یان فەرمانێك کە پێویست بوو لەسەری لە رووی یاساییەوە بیکات.

تێبینی:دادگای کارگێری تایبەتمەند نیە بە سەیرکردنی ئەو تانانەی کە پەیوەندیدارن بە مانەی خوارەوە:
کارەکانی سەروەری.
بڕیارە کارگێڕییەکان کە یاسا رێگای بۆ زوڵم لیٚ وەرگرتنی یان ناڕەزایی لە سەردەربڕینی یان تانە لێدانی بۆ داناوە.

ئیختصاصی جۆری دادگاکانی ئیستئناف
جۆرە دادگای ئیستئناف دوو اختصاصی جۆری پەیڕەو دەکات کە ئەمانەن:
یەکەم: الاختصاص الاستئنافي:
ئەم ئیختصاصەش لەم ئەحکامانەی لای خوارەوە دەبیٚ :
١- ئەو ئەحکامانەی کە لە دادگای بەراییەوە ( محكمه البداوه ) دەردەچیٚ بە پلەی یەکەم لەو داوایانەی کە بەهاکەیان لە (١٠٠٠) دینار زیاترە.
٢- ئەو ئەحکامانەی کە پەیوەندییان هەیە بە بابەتی ئیفلاس.
٣- ئەو ئەحکامانەی کە پەیوەندیان هەیە بە بابەتی پاکتاوکردنی کۆمپانیاکان.

دووەم: الاختصاص التمييزي:
وەئەمەش ئەمانەی لای خوارەوە دەگرێتەوە :
١- سەیرکردن بەشێوەی تەمییزی ئەو ئەحکامانەی کە لە دادگای بەرایی دەردەچن بە پلەی کۆتایی (بدرجه اخيره).
٢- سەیرکردن بەشێوەی تەمییزی ئەو قرارانەی کە لە دادگای بەرایی دەردەچیٚ تەنها ئەوانەی کە ئاماژەیان پێکراوە لە ماددەی (١/٢١٦) لە قانون مرافعاتی مەدەنی کە ئەمانەن: ئەو بریارانەی دەردەچیٚ دەربارەی ( القضاء المستعجل والحجز الاحتياطي و القضاء الولائي )، وە ئەو بریارانەی کە دەردەچیٚ بە بەتاڵ کردنەوەی عەریزەی داوا یاخود راگرتنی داوا ....هتد. وە ماوەی تانە گرتن لەم قرارانە حەوت رۆژە دەست پیٚ دەکات لە رۆژی دوای تەبلیغ کردنی قرارەکە.

ئیختصاصی جۆری دادگای تەمییز
١- سەیرکردنی ئەو ئەحکامانەی کە لە دادگای ئیستئناف دەردەچێت بە سیفەتی ئیستئنافی.
٢- سەیرکردنی ئەو ئەحکامانەی کە لە دادگای بەراییەوە دەردەچێت بە پلەی یەکەم (بدرجه اولى ).
٣- ئەو ئەحکام و قرارانەی کە لە دادگای باری کەسایەتی دەردەچێت.
٤- ئەو ئەحکام و قرارانەی دادگای کار.
٥- ئەو بابەتانەی کە یاسایەکی تایبەت ئاماژەی پێدەکات کە تەمییز دەکرێنەوە لە بەرامبەر دادگای تەمییز وەکو قراراتی ئەنجومەنی سەندیکای پیشەیی.
٦- یەکلای کردنەوەی بابەتی گواستنەوەی داوا هەروەها سکاڵا کردن لە دادوەران ئەگەر هاتوو داوایەکە سکاڵا کردن بوو لە سەرۆکی یان لە یەکیٚ لە دادوەرانی دادگای استئناف.
٧- سەیرکردنی ئەو ئەحکامانەی کە لە دادگای کارگێرییەوە دەردەچێت.

**ئیختصاصی جۆری دادگای دەستوری:**

**بە پێی ماددەی (٩٥) لە پرۆژەی دەستوری هەرێمی کوردستان ئەوە دادگای دەستوری تایبەتمەند دەبێ بە تەمەشاکردنی ئەم کاروبارانەی خوارەوە:**

**یەکەم: راڤە کردنی دەقی ماددەکانی دەستووری هەرێمی کوردستان.**

**دووەم:**

**١- چاودێری بەسەر دەستووریبوونی یاساکاندا, لەسەر داوای سەرۆکی هەرێمی کوردستان ، یان ئەنجومەنی وەزیران، یان دە کەس لە ئەندامانی پەرلەمان.**

**٢- بڕیاردان لەسەر رەوایی مەرسوم و پێڕەوو بڕیارو رێنماییەکان, لەسەر داوای هەر کەسێکی خاوەن بەرژەوەندی ڕاستەوخۆ.**

**سێیەم: یەکلا کردنەوەی دەفعێك کە پێشکەش کراوە لە داوایەکدا کە دراوەتە بەردەم دادگا سەبارەت بە دەستووری نەبوونی یاسایەك، یان رەوا نەبوونی بڕیارێك، یان پێڕەوێك، یان رێنماییەك. دادگاش دەبێ داوایەکە دوابخات تا ئەو کاتەی ئاکامی دەفعەکە یەکلا دەکرێتەوە.**

**چوارەم: پەسەند کردنی ئەنجامەکانی راپرسی و هەڵبژاردنەکانی گشتی بۆ سەرۆکی هەرێم و پەرلەمانی کوردستان-عیراق.**

**پێنجەم: یەکلاکردنەوەی دەستووریبوونی ئەو هەموارکردنەی پێشنیاز دەکرێ بۆ دەستووری هەرێمی کوردستان و گونجاوبوونی لەگەڵ مەرجەکانی ماددەی(١٢٠)ی ئەم دەستوورە.**

**شەشەم: دادگایی کردنی سەرۆك یان جێگری سەرۆکی هەرێمی کوردستان پاش ئەوەی بە پێی ماددەی (٦٢)ی ئەم دەستوورە لە لایەن پەرلەمانەوە تۆمەتیان دەدرێتە پاڵ. بۆ بەتاوانبارکردنی سەرۆك یان جێگرەکەی, پێویستە بەلای کەم پێنج ئەندامی دادگا ڕەزامەندی لەسەر بدەن.**

**حەوتەم: یەکلاکردنەوەی ئەو داوایانەی کە بە پێی ماددەی(١٩/بڕگەی هەژدەهەم/٣)ی ئەم دەستوورە بەرزکراونەتەوە.**

**هەشتەم: یەکلاکردنەوەی ئەو تانووتانە کە پێوەندیان بە دروستیی ئەندامەتی و لابردنی پارێزراوەیی (حصانە) لەسەر ئەندامی پەرلەمانەوە هەیە.**

**وە ماددەی (٩٧) ئاماژە بەوە دەکات کە:**

**حوکمەکانی دادگای دەستووری بنەڕەتین و لەسەر هەمووان جێبەجێ دەکرێن. ئەگەر دادگا لە کاتی یەکلاکردنەوەی دەستووریبوونی یاسایەکان, یان ڕەواییبوونی مەرسووم و و پێڕەو و بڕیار و ڕێنماییەکان, بڕیاری دا کە هەر کام لەوانە پێچەوانەی دەستوور یان یاسایە, دەبێ دەسەڵاتی پەیوەندیدار لە هەرێمی کوردستان ئاگادار بکاتەوە تا**

هەرچی پێویستە ئەنجامی بدا بۆ لابردن, یان ڕاستکردنەوەی سەرپێچیەکە.

**جۆری چوارەم: ئیختصاصی شوێنی (الاختصاص المكاني):**

ئیختصاصی شوێنی واتە: دیاری کردنی ئەو دادگایەی کە دەبێ داوایەکەی لێ بەرز بکرێتەوە لە کاتێك ئەگەر هاتوو چەند دادگایەك هەبوو لەو شوێنە هەمان اختصاصیان هەبوو، وەئەم اختصاصە دیاری دەکرێت بە پێی دابەش بوونی ئیداری وە بەپێی یاسای پارێزگاکان بۆ ساڵی ١٩٦٨ ، وە دەتوانین ئەم اختصاصە لە سێ خاڵ چڕ بکەینەوە:

**یەکەم: الاختصاص المكاني في دعاوى الحق العيني العقاري (ئیختصاصی شوێنی لە داوای عەقار):**

ئەو داوایانەی کە پەیوەندیان هەیە بە حەقی عەینی عقاری بەرز دەکرێتەوە لە بەرامبەر ئەو دادگایەی کە شوێنی بوونی عقارەکەی لێیە، وەئەگەر هاتوو چەند عقارێك بوو بەڵام هۆکاری داوایەکە یەك بوو ئەوا دەتوانرێ داوایەکە بەرز بکرێتەوە لە شوێنی یەکێکیان.

**دووەم: الاختصاص المكاني في دعاوى الدين والمنقول: (ئیختصاصی شوێنی لە داوای قەرز و مەنقول):**

ئەم جۆرە داوایانە بەرز دەکرێتەوە لە بەرامبەر دادگای شوێنی نیشتەجێ بوونی داوالێکراو یان لە مەڵبەندی موعاملاتی یان ئەو شوێنەی کە ئیلتزامەکەی لێ دروست بووە یان ئەو شوێنەی کە ئیلتزامەکەی لێ جێبەجێ دەکرێت یان ئەو شوێنەی هەردوو لایەن هەڵیان بژاردووە بۆ بەرز کردنەوەی داوا.

وە ئەگە هاتوو چەند داوا لێکراوێك هەبوو وە هۆکاری داوایەکە یەك بوو ئەوا دەتوانرێ داوایەکە بەرز بکرێتەوە لە شوێنی نیشتەجێ بوونی یەکێکیان.

وە ئەگەر هاتوو داوا لێکراو بازرگان بوو ئەوا داوای ئیفلاس بەرز کرێتەوە لە دادگای شوێنی بوونی مەحەلە ئیفلاس کراوەکە.

وە ئەگەر هاتوو داوا لێکراو شەخصێکی مەعنەوی بوو وەکو کۆمپانیا ئەوە داوایەکە بەرز دەکرێتەوە لە بەرامبەر ئەو دادگایەی کە نزیکە لە مەڵبەندی کارگێری سەرەکی ئەو کۆمپانیایە.

**سێیەم: الاختصاص المكاني في دعاوى الاحوال الشخصيه: ئیختصاصی شوێنی لە داوای باری کەسایەتی:**

ئەم داوایانە بەرز دەکرێتەوە لە شوێنی نیشتەجێ بوونی داوا لێکراو، وەدەکرێ داوای هاوسەرگیری بەرز بکرێتەوە لە بەرامبەر دادگای شوێنی گرێبەستەکە، وە دەکرێ داوای جیا بوونەوە (الطلاق) بەرز بکرێتەوە بۆ بەرامبەر یەکێ لەم دوو دادگایەی سەرەوە یاخوود دادگای شوێنی دروست بوونی هۆکاری داوایەکە.

<u>تێبینی</u>: ئیختصاصی مەکانی لە نیزامی عامدا نیە چونکە لە بنەڕەتدا دانراوە بۆ بەرژەوەندی داوا لێکراو بۆیە دەکرێ تنازولی لێ بکرێت یاخود ئیتیفاق بکرێ لە سەر پێچەوانەی هەروەها دادگا سەربەخۆ ئاماژەی پێ ناکات.

**الدعوى القضائية (داواى دادگەرى ) :**

**پێناسە: ماددەى (٢) لە قانونى مرافعاتى مەدەنى عيراقى پێناسەى داواى (دعوى) كردووە بەوەى: (طلب شخص حقه من آخر أمام القضاء )، واتە: ( كەسێك داواى مافى خۆى دەكات لە كەسێكى تر لە بەرامبەر دادگا)، لەم پێناسەيە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە كە داوا چوار عنصرى سەرەكى هەيە كە ئەمانەن:**

**١- (طلب ) داواكردن:** واتە دەبێت داوا لە دادگا بكرێت بۆ وەرگرتنەوەى ماف، وە ئەم داوايەش دەبێ بە نوسراو بێ واتە بە عريزەيەك بێ.

**٢- (حق) ماف:** واتە دەبێ مافێك هەبێ كە زەوت كرابێ ياخود مەترسى لە سەر بێ.

**٣- امام القضاء:** واتە دەبێت داواى مافەكە بەرزبكەيەوە بۆ بەرامبەر دادگا نەك شوێنێكى تر.

**٤- أشخاص الدعوى:** واتە داوا دروست دەبێت لە نێوان چەند كەسێكدا.

**((مەرجەكانى وەرگرتنى داوا ))**

١ . الاهلية.   ٢- . الصفة او الخصومة.   ٣- . المصلحة.

**يەكەم: الاهليه:**

**ماددەى (٣) لە قانون المرافعات المدنيه ئاماژە بەوە دەكات كە دەبێ هەردوو لايەنى داوا (داواكار و داوالێكراو) خاوەنى اهلييەى تەواو بن، واتە خاوەنى اهليەى إدعاو ياخود تعاقد بن، وە بەپێچەوانەوە ناتوانن خودى خۆيان دەعوا بەرزبكەنەوە بەڵكو دەبێ لە لايەن نائبێكەوە واتە جێگريەوە بەرز بكرێتەوە، هەر بۆيە شێت و مناڵ ناتوانن داوا بەرز بكەنەوە.**

**وە سەبارەت بە شەخصى معنوى ئەوا دەعوا بەرز دەكرێتەوە لە لايەن نوێنەرى ياساييەوە، وە ماددەى (٤٨) لە قانونى مدنى عيراقى جێبەجێ دەكرێت لەم بارەيەوە، وە دەبێت دەستەواژەى (اضافةً الى وظيفته) بنوسرێت.**

**دووەم: الصفة او الخصومة**

**ماددەى (٤) لە قانونى مرافعاتى مەدەنى عيراقى ئاماژەى بەوە كردووە كە دەبێ داوالێكراو سيفەتى خصومەى هەبێت، وە خەصم ئەو كەسەيە كە:**

**١- إذا ترتب على إقراره حكم: واتە ئەگەر هاتوو اعترافى كرد لە بەرامبەر دادوەر كە مافێكى لە سەرە ئەوا دادوەر حوكمى لەسەر بدات وە پێ ی ببات.**

**وة استثناء لەم بنەمايە ئەوەيە ماددەى (٤) لە هەمان ياسا قبولى خصومەى وەلى و وەصى و قەييمى كردووە لەگەڵ ئەوەى كە اعترافى ئەمانە جێبەجێ ناكرێ لەسەر ئەوانەى لە ژێر دەستيانن وەكو: منال و شێت .....هتد.**

**٢- ان يكون محكوماً او ملزماً بشئ على تقدير ثبوت الدعوى : واتە ئەگەر هاتوو دەعواكە إسپات بوو ئەوا پێويستە لەسەرى شتێك بدات، وە بە پێچەوانەوە ئەو دەعواكە ڕەد دەكرێتەوە وە تەماشاى ناكرێت، وەكو: ئەو كەسەى كە داوا بەرز دەكاتەوە دژى يەكێكى تر چونكە قەرزى پێنەداوە ياخود مالێكى پێ نەبەخشيوە، چونكە هيچ الزامێكى**

یاسایی لەم حالەتەدا نییە.

سێ یەم: **المصلحە:**

واتە ئەو کەسەی کە داوا بەرز دەکاتەوە (داواکار) پێویستە بەرژەوەندییەکی هەبێ، وە ئەم بەرژەوەندیە بریتی یە لەو سوود و قازانجە کرداریە کە یاسا إقراری دەکات و دەیپارێزێت، وە بەپێچەوانەوە هەر داوایەك مصلحەی تێدا نەبوو ئەوا دادوەر رەتی دەکاتەوە و سەیری ناکات.

وە ماددەی (٦) لە قانون مرافعاتی مدنی عیراقی کۆمەلێ مەرج و خصائصی داناوە کە دەبێ لە ناو ئەو مصلحەیە هەبێ لەوانەش:

١- ان تكون المصلحة معلومة: واتە دەبێ ئەو بەرژەوەندیە دیاریکراو و ئاشکرابێت نەوەك شتێکی نادیار بێت، چونکە بە پێی ئەو زانینە بەهای دەعواکە دادەنرێ.

٢- ان تكون المصلحة حالة: واتە دەبێ ئەو مافەی کە داواکار داوای دەکات لە عریزەکەیدا کاتی هاتبێت وە ئێستا بێت، نەوك بەسترابێتەوە بە مەرجێك یاخود کاتێکی بۆ دانرابێ وە کاتەکەی نەهاتبێت، بۆ نموونە/ شکایەت کردن لە کرێچی کە چی هێشتا ماوەی کرێیەکەی ماوە یان سەرە مانگ نەهاتووە.

ان تكون المصلحة ممكنة: واتە دەبێ ئەو بەرژەوەندیە مومکین بێ وە موستەحیل نەبێ چ لە رووی یاساییەوە یان لە رووی ماددییەوە.

ان تكون المصلحة محققة: واتە دەبێ لە واقیع دا بە شێوەیەکی کرداری دەست درێژی کرابێتە سەر ئەو بەرژەوەندییە و ئەو مافەی کە یاسا پارێزگاری لێدەکات، واتە دەبێ زەرەرەکە هەبێت و رووی دابێت ئینجا دەتوانی داوا بەرزبکەیەوە.

استثناء علی شروط المصلحة:

١- المصلحة المحتملة: ماددەی (٦) لە قانون مرافعاتی مدنی عیراقی رێگەی داوە بە شێوەیەکی استپنائی داوا بەرزبکرێتەوە لەسەر ئەساسی ئیحتمالی ئەگەر هاتوو مەترسیەکی راستی هەبوو لەوەی کەزەرەر بە داواکار بدرێ.

وەنمونەی مصلحەی محتەمەلە ئەمانەن :

١- دعاوی تثبیت الحق: داوای چەسپاندنی ماف:

واتە مافێك هەیە بەلام شك و گومانی لەسەرە بۆیە داواکار داوا بەرزدەکاتەوە بۆ چەسپاندنی مافەکە.

٢- دعاوی قطع النزاع : داوای کۆتایی هێنانی ناکۆکی:

واتە الزام کردنی تاکێك کە دەلێت مافێکم هەیە لەسەر یەکێکی تر لە دەرەوەی دادگا کە بسەلمێنێ لە بەرامبەر دادگا وە بە پێچەوانەوە حوکم دەدرێت بە ناحەقی لەوەی کە داوای دەکات.

٣- دعاوی تثبیت الحالة : داوای چەسپاندنی حالەت: واتە مەترسیەك هەیە لە بزربوونی نیشانەی رووداوێکی یاسایی یاخود ماددی کە دەبێتە هۆی کێشەیەك لە ئاییندە دا.

**٢- دەكرێ داوای مافێكی دواخراو (مؤجل) بكرێت بەڵام دەبێ ڕەچاوی كات بكرێت لە كاتی حوكم دان، ولەم حاڵەتەدا داواكار تەحەمولی مصاريفی دەعوا دەكات.**

**تقسيم الدعاوى**

**قانونی مرافعاتی عیراقی دەعوای دابەش كردووە بە پێی ئەو مافانەی كە دەیان پارێزێت بۆ چەند بەشێك لەوانەش:**

**یەكەم: الدعاوى الشخصيه والدعاوى العينيه والدعاوى المختلطة:**

**١- الدعاوى الشخصيه: ئەو دەعوایانەیە كە پەیوەندیان هەیە بە مافێكی شەخصی، وەكو ئەو دەعوایەی كە دائن - خاوەن قەرز- بەرزی دەكاتەوە دژی مدين - قەرزار- بۆ داوای قەرزەكەی. وئەم دەعوایانە بە شێوەیەكی حەصر نەهاتووە چونكە ناكرێ مافەكانی شەخصی حەصر بكرێت.**

**٢- الدعاوى العينيه: ئەو دەعوایانەیە كە پەیوەندیان هەیە بە مافێكی عەینی، وەكو دەعوای مولكیە، وە لەبەر ئەوەی مافەكانی عەینی - اصلی یان تەبەعی- لە یاسادا بە شێوەیەكی حەصردا هاتووە بۆیە ئەم جۆرە دەعوایانەش لە یاسادا بە شێوەیەكی حەصردا هاتووە.**

**٣- الدعاوى المختلطة: ئەو دەعوایانەیە كە پەیوەندیان هەیە بە حەقێكی شخصی وعەینی لە هەمان كاتدا، وەكو دەعوای هەڵوەشاندنەوەی گرێبەست لەلایەن فرۆشیارەوە وە گەڕاندنەوەی شتەكە.**

**دووەم: الدعاوى المنقولة والدعاوى العقارية:**

**١- الدعاوى المنقوله: ئەو دەعوایانەیە كە پەیوەندیان هەیە بەماڵێكی مەنقولەوە.**

**٢- الدعاوى العقارية: ئەو دەعوایانەیە كە پەیوەندیان هەیە بە ماڵێكی عقارییەوە یاخود مافێكی عەینی عقاری، وە ئەم دەعوایە دەبێت بە دوو بەش :**

**ا. دعوای الملكية: ئەو داوایەیە كە پارێزگاری لە مافێكی عەینی عقاری دەكات بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ، بە واتایەكی تر داواكار لەم داوایە دەڵێت من خاوەنی عقارەكەم یاخود خاوەنی مافێكی عەینی لەسەری وە داوای پارێزگاری ئەم مافانە دەكا لە دژی بەرامبەر.**

**ب. دعاوى الحيازة (داوای بن دەستانە): ئەو داوایەیە كە داواكار تیایدا داوای پارێزگاری كردن لە حیازەتی بەسەر ئەوشتەدا بكرێت.**

**داوای حیازە ئەم تایبەتمەندیانەی (خصائص) لای خوارەوەی هەیە:**

**١- یاسا دەعوای حیازەی داناوە بۆ پارێزگاری كردنی ئەو كەسەی كە دەستی بەسەر ئەو شتەدا گرتووە، وەسەلماندنی ئاسانكردووە كە دەكرێ بە شاهێدی یاخود بەهەر وەسیلەیەكی تر، بە پێچەوانەی دەعوای مولكیە كە ناكرێ بسەلمێنرێت تەنها بەسەنەدی فەرمی نەبێت.**

**٢- دەعوای حیازە پارێزگاری لە مافێكی عەینی عقاری دەكات، بەلام مافی عەینی مەنقول تەنها پێویستی بە حیازە هەیە نەوەك بە دەعوا چونكە بنەمایەكمان هەیە دەڵێت ( الحيازة في المنقول سند الملكية ).**

**جۆرەکانی دەعوا حیازە**

**١- دعاوى استرداد الحیازة (دەعوای گێرانەوەی حیازە): ئەوکەسەی کە دەستی بەسەر عقارێکدا گرتووە (حائز العقار) ئەگەر هاتوو حیازەکەی لە ژێر دەستی دەرکرا ئەوە دەتوانێ دەعوای گێرانەوەی حیازە بەرز بکاتەوە بۆ بەرامبەر دادگای بەرایی لە ماوەی سالێکدا لە بەرواری لە ژێر دەست دەرکردنەکە، وە ئەم دەعوایە دوو مەرجی هەیە ئەوانیش بریتین:**

**ا. دەبێ حائز بۆ ماوەی سالێك ئەو شتەی کە لێی سەندراوە لە ژێر دەستی دابێت.**

**ب. دەبێ دەعواکە لە ماوەی سالێك لە بەرواری لە ژێر دەست دەرکردنەکەدا بەرز بکرێتەوە**

**٢- دعوى منع التعرض ( داوای رێگری نەکرتن ): ئەگەر هاتوو حائز رێگری لێ کرا بەلأم نەگەیشتە رادەی لە ژێر دەست دەرکردن ئەوا حائز بۆی هەیە داوای منع التعرض بەرز بکاتەوە وە داوای رێگری نەکردن بکات، وە ئەم دەعوایەش پێویستی بە سێ مەرج هەیە:**

**ا. دەبێ حائز بۆ ماوەی زیاتر لە سالێك ئەو عقارەی کە رێگری لێ دەکرێت لە ژێر دەستی دابێت.**

**ب. دەبێ دەعواکە لە ماوەی سالێك لە تاریخی رێگری نەکردنەکە بەرز بکرێتەوە.**

**ج. دەبێت رێگریەکە بە کردار رووی دابێ، چ رێگری ماددی بێت یاخود تصرفێکی قانونی بێت.**

**٣- دعوى وقف الاعمال الجدیدة (داوای راگرتنی کارە نوێیەکان): ئەمەش وا دەخوازێت کە حائز توشی رێگری بێت لە رێگەی ئەنجامدانی کارێکی نوێ لەسەر ئەو عقارەی کە لە ژێر دەستی دایە، بەلأم هێشتا ئەو کارە تەواو نەبووە بەلأم تەهدیدی حیازەکەی دەکات، وەئەم دەعوایەش پێویستی بە دوومەرج هەیە:**

**ا. دەبێ حائز بۆ ماوەی سالێك ئەو عقارەی لە ژێر دەستی دابێت.**

**ب. دەبێ رێگری لێ بکرێت بە ئەنجام دانی کاری نوێ، بەلأم دەبێ تەواو نەکرابێ.**

إجراءات إقامة الدعوى – الاجراءات القضائیة

**اجرائاتی قضائی**: کۆمەڵە کارێکی یاساییە کە تەواوکەری یەکترن، ئامانجی وەلأم دانەوەی ئەو کەسەیە کە داوای پارێزگاری دادگەری کردووە وە کۆتایی دێت بەدەرچوونی حوکمێك.

**((مستلزمات صحة الاجراء القضائي))**

**١- المستلزمات الموضوعية (الارادة المحل السبب)**

**٢ المستلزمات الشكلية (الشكلية كظرف الشكلية كعنصر)**

**كظرف مكان كظرف زمان**

**یەکەم/ المستلزمات الموضوعیة:**

**الارادە: واتە دەبێ داواکار بە ئیرادەی خۆی عەریزەی داوا بنوسێت وەخاوەن اهلییە ئیرادەیەکی تەواو بێت وە دوور بێت لە عوارچ و موانع و عیوبی ئیرادە، ئەوا ئەوکات عەریزەکە ئاسەواری یاسایی لێ دەکەوێتەوە.**

**المحل: واتە ناوەرۆکی ئیجرائی دادگەری، وە محلی داوا ئەو شتەیە کە داواکار داوای دەکات لە عەریزەکەیدا، وە پێویستە مەحەل مەوجود و موعەین و مەشروع بێت.**
**السبب: واتە ئەوکاتەی کە داواکار عەریزەی داوا بەرزدەکاتەوە ئەوە دەبێ هۆیەك و قەصدێکی دیاری کراوی هەبێت لە داوایەکە.**

**دووەم/ المستلزمات الشكلية:**

**١- الشكل كعنصر من عناصر الاجراء: واتە ئەو رووکەشییە بۆتە بەشێك لە رێکاریە دادگەریەکان، بۆ نموونە یاسا الزامی کردووە کە دەبێت داوا بە عەریزە پێشکەش بکرێت هەروەها رەسمی ئەو داوایە بدات .....هتد، کە واتا عەریزە وەکو شکلیەتێك بۆتە بەشێك لە داوا.**
**٢- الشكل كظرف يلزم ان يتم فيه الاجراء:**
**أ- الشكل كظرف مكان: واتە دەبێ ئیجرائاتی دادگەری لە شوێنی دیاریکراوی خۆی ئەنجام بدرێ، بۆ نمونە: وەرەقەی تەبلیغ دەبێ بدرێتە دەست داوا لێکراو لە شوێنی نیشتەجێ بوونی یاخود لە شوێنی کارکردنی، هەروەها داوای قەرز و مەنقول لە شوێنی نیشتەجێ بوونی داوا لێکراو بەرز دەکرێتەوە، وە داوای عقار لە شوێنی بوونی عقارەکەیە ... ..هتد.**
**ب- الشكل كظرف زمان: کات شوێنێکی (پانتایەکی) زۆر گرنگی گرتووە لە یاسای مرافعاتی مدنی عیراقی لەبەر ئەوەی دەرەنجامی ترسناکی لێ دەکەوێتەوە کە هەندێ جار دەگاتە ئەوەی کە تاك مافی خۆی لە دەست بدات، بۆیە دەبێ هەموو ئیجرائاتەکانی دادگەری لە کات و ساتی خۆی ئەنجام بدرێ.**

**كيفية اقامة الدعوى**
**ماددةي (٤٤) لە یاسای مرافعاتی مەدەنی دەڵێ: ((كل دعوى يجب ان تقام بعريضة))، واتە پێویستە هەموو داوایەك بە عەریزە بەرز بکرێتەوە، وئەم عەریزەیە پێویستە کۆمەڵێ بەیاناتی تێدابێ کە ماددەی (٤٦) ئاماژەی پێ کردووە، وئەم بەیاناتانەش ئەمانەن:**
**١- اسم المحكمه التي تقام امامها الدعوى (ناوی ئەو دادگایەی کە دەعواکەی لە بەرامبەر بەرز دەکرێتەوە):**
**ئامانجی باس کردنی ئەم بەیانە دیاریکردنی ئەو دادگایەیە کە دەعواکەی لە بەرامبەر بەرز دەکرێتەوە لە ڕووی ئیختصاصی جۆری و شوێنی.**
**٢- تاريخ عريضة الدعوى:**
**وە ئەم بەیانەش سودی هەیە بۆ زانینی مێژوی بەرز کردنەوەی عەریزەی دەعوا بۆ دادگا.**
**٣- ذكر اسم كل من المدعي والمدعي عليه وتاريخ ولادتهما وشهرتهما وصنعتهما ومحل اقامتهما، واذا كان المدعي عليه اجنبياً ذكر جنسيته مع بيان هل ان الدعوى اقيمت عليه اصالةً ام كونه ممثلاً لشخص اخر.**
**٤- بيان المحل الذي يختاره المدعي لغرض التبليغ.**
**٥- بيان موضوع الدعوى:**
**واتە باس کردنی ئەو بابەتەی کە داواکار داوای دەکات لە دادگا وە دەیەوێت بیپارێزێت، بۆ نموونە ئەگەر هات**

بابەتی دەعوا قەرز بوو ئەوە پێویستە باسی هۆیەکەی بکات ومێژووی قەرزدانەکە و وەرگرتنەوەی، وە ئەگەر عەقار بوو ئەوە پێویستە شوێن و سنورەکەی دیاری بکات.

**٦- وقائع الدعوى وأدلتها وطلبات المدعي واسانيدها:**

واتە باسکردنی ئەو وقائعە یاسایانە و ڕووداوە ماددیانەی کە دەبنە هۆی بەرز کردنەوەی دەعواکە، هەروەها تەقدیم کردنی ئەو بەڵگانەی کە یاسا اعتراف پیێ دەکات، هەروەها دیاریکردنی ئەو سەرچاوە یاساییەی کە داواکار پشتی پیێ دەبەستیێ وەکو عقد یان ارادة المنفردة یان فعل الضار یان الاثراء بلا سبب یان القانون.

**٧- توقيع المدعي او وكيله واذا كان لا يعرف الكتابة فيوقع بطبعة ابهامه فقط.**

**تێبینی:**

**ئەو موستەمسەکانەی کە لەگەڵ عەریزەی دەعوا بەرز دەکرێتەوە:**

پێویستە لەسەر داواکار لە کاتی بەرز کرنەوەی دەعوا ڕەچاوی ژمارەی داوالیێکراوەکان بکات بە شێوەیەك کە دەبیێ بۆ هەر داوالیێکراوێك عەریزەیەك پێشکەش بکات، هەروەها دەبیێ وێنەیەك لەو بەڵگانە کە پشتی پیێ دەبەستیێ پێشکەش بکات.

**س/ الجزاء المترتب على النقص في بيانات عريضة الدعوى؟ ئەو سزایەی کە دێتە کایەوە لە کاتی نەقص بوون لە بەیاناتی عەریزەی داوا؟**

وەڵام: ماددەی (٥٠) لە یاسای مرافعاتی مەدەنی دەڵیێ: ئەگەر هەڵەیەك یاخود نەقصێك هەبوو لەو بەیاناتەی کە پێویستە لە عەریزەی دەعوا کە وای دەکرد داواکار یان داوالیێکراو نەناسریێ یان شوێنی تەبلیغ کردنی دیاری نە کردبوو، ئەوە لەم حاڵەتانەدا داوا لە داواکار دەکرێت کە ئەو هەڵەیە یاخود نەقصەیە چارەسەر بکات لە ماوەیەکی گونجاو وە بەپێچەوانەوە عەریزەکە ابگال دەکرێت بە بڕیاری دادگا.

**چۆنێتی پێشکەش کردنی عەریزەی داوا بۆ دادگا:**

دەبیێ عەریزەی داوا ڕاستەوخۆ بدرێتە دادوەری دادگا، پاشان دادوەر دەینێرێت بۆ لای معاونی قضائي بۆ وەرگرتنی رسومات و تۆمارکردنی لە هەمان ڕۆژ لە سجلی سەرەکی وە دانانی ژمارە بۆی پاشان ختم کردنی عەریزەکە و هەموو ئەو ئەوراقانەی کە لەگەڵی هاوپێچن، پاشان دادگا ڕۆژی دادگایی کردنەکە دیاری دەکات، وە داواکار ئاگادار دەکرێتەوە هەروەها وێنەیەك لە عەریزەی دەعوا و هاوپێچەکەی دەنێردرێت لە ڕێگەی دادگاوە بۆ داوالیێکراو وتبلیغ دەکرێت کە ئامادەبێت لە ڕۆژی دادگاییەکە.

**وحدة عريضة الدعوى:**

وەکو ڕێسایەکی گشتی لە یاسای مرافعاتی عیراقی دەبیێ بۆ هەر دەعوایەك وکێشەیەك عەریزەیەك بەرز بکرێتەوە، وە ئەگەر عەریزەکە زیاتر لە دەعوایەکی تێدا بوو ئەوە دادگا داوا لە داواکار دەکات کە داواکەی سنوردار بکات بە یەك دەعوا، بەڵام یاسای مرافعات چەند ئیستپنایەکی داناوە لەم ڕێسایە کە ئەمانەی لای خوارەوەن:

١- دەكرێ بە یەك عەریزە داوای مافێكی عەینی لەسەر چەند عەقارێك بكرێت ئەگەر هۆكار و خصوم (لایەتەكان ) یەك بوون.
٢- دەكرێ بە یەك عەریزە داوای چەند مافێكی عەینی و شەخصی لەسەر منقول بكرێت.
٣- ئەگەر هاتو چەند داواكارێك هەبوو - فرە داواكار- وە داواكەیان هاوبەش بوو یاخود پەیوەندی هەبوو لە نێوان داواكانیان ئەوە دەكرێ دەعوا بەرزبكرێتەوە بە یەك عەریزە.
٤- ئەگەر چەند داوالێكراوێك هەبوو - فرە داوالێكراو- وە ئەو دەعوایەی كە لە دژیان بەرزكراوەتەوە یەك بوو یاخود پەیوەنیان بە یەكەوە هەبوو ئەوە دەكرێ دەعوا لە دژیان بەرزبكرێتەوە بە یەك عەریزە.
٥- دەكرێ عەریزە چەند شتێك لەخۆ بگرێت وەكو ئەو داوایانەی تەواوكەری دەعواكەن یاخود لە دەعواكە پەیدابوون. (یجوز ان تتضمن العریضة الطلبات المكملة للدعوى او المترتبة علیها او المتفرعة عنها)).

آثار إقامة الدعوى: **ئاسەواری بەرزكردنەوەی داوا:**

**١- قیام حالة النزاع: دەست پێكردنی حاڵەتی ناكۆكی:**

گرنگترین ئاسەواری بەرزكردنەوەی دەعوا ئەوەیە كە ناكۆكی لە ڕووی یاساییەوە لە بەرامبەر دادگا دەست پێدەكات و دادوەر مولزەم و ناچاردەبێت بە تەمەشاكردنی دەعواكە هەتا دەگاتە دەرچونی حوكم. وە بەپێچەوانەوە دادوەر تۆمەتبار دەكرێت بە تاوانی انكار العداله.

**٢- قطع التقادم: پچرانی تقادم:**

ئیقامەی دەعوا لە بەرامبەر دادگا تقادم دەپچڕێنێ كە وادەكات گوێ لە دەعوا نەگیرێ، وە ئەمەش ماددەی (٤٣٧) ی یاسای مەدەنی عیراقی ئاماژەی پێكردووە.

**٣- سریان الفوائد القانونیة:**

ماددەی (١٧١) لە یاسای مرافعاتی عیراقی ئاماژە بەوە دەكات كە ئەگەر هاتو بابەتی كێشەكە مەبلەغێك پارە بوو وە دیاریكراو بوو وە مەدین دواكەوت لە دانەوەی ئەوە ناچارە كە دەبێ بە دائن فوائدی یاسایی بدات لە بری ئەم دواكەوتنە كە بەهاكەی ٤٪ لە بابەتی مەدەنی وە ٥٪ لە بابەتی بازرگانی، بەڵام ئەوەی گرنگە لێرە ئەوەیە كە ئەم فوائدە دەست پێ دەكات تەنها لە كاتی بەرزكردنەوەی دەعوا بەمەرجێك ئەگەر ڕێكەوتنی نێوانیان یاخود عورفی بازرگانی كاتێكی تری دیاری نە كردبوو.

التبلیغات القضائیة

مضمون ورقة التبلیغ: ناوەڕۆكی وەرەقەی تەبلیغ:

وەرەقەی تەبلیغ ئەو وەرەقەیەیە كە لە لایەن دادگاوە دەردەچێت بە دوو نسخە یان زیاتر یەكێكیان دەدرێت بەو كەسەی كە تەبلیغ دەكرێت وە ئەوەی تریان دەگەرێتەوە بۆ دادگا بۆ ئەوەی بپارێزرێت لە ئیزبارەی دعوی لە پاش تبلیغ كردن.

**وەرقەی تبلیغ ئەم بیاناتانەی خوارەوەی تێدایە:**

١- ناوی ئەو دادگایەی کە پێویستە لە بەرامبەری ئامادەبێت لەگەڵ دیاریکردنی ڕۆژ و کاتژمێری ئامادەبوون.

٢- ژمارەی دعواکە.

٣- ناوی داواکاری تبلیغ و ناوبانگی و کاری یان وەزیفەی وئەگەر شوێنی نیشتەجێی دیار نەبوو ئەوە دوا شوێن دەنوسرێت.

٤- ئەو شوێنەی کە داواکەری تبلیغ هەڵیبژاردوە بۆ مەبەستی تەبلیغ.

٥- ناوی ئەو کەسەی کە مەبەستە تبلیغ بکرێت و کاری یان وەزیفەی و شوێنی نیشتەجیٚ بونی، وە ئەگەر دیار نەبوو ئەوا دوا شوێنی نیشتەجیٚ بوونی.

٦- ناوی ئەو کەسەی کە وەرقەی تبلیغی وەردەگرێت، و دیاری کردنی وەزیفەکەی وە واژووی لەسەر نسخە ئەصڵەکە یان اسپات کردنی وەرنەگرتنی تبلیغەکە.

٧- ناوی ئەو کەسەی کە تبلیغەکە دەکات وە واژووی، لەگەڵ دیاری کردنی رۆژ و مانگ و ساڵی تبلیغەکە.

**گروپی ( A ) زۆرم خۆش ئەوێن**

اساليب تبليغ الاوراق القضائية:

**یەکەم/ الاشخاص القائمون بالتبليغ:**

**مادەی (١/١٣) لە یاسای مرافعات عێراقی ئەو کەسانەی دیاری کردووە کە هەڵدەستن بە ئەنجامدانی کاری تبلیغ کردن کە ئەم کەسانەی لای خوارەوەن:**

**١- الاشخاص الذين يعينهم وزير العدل:**

واتا ئەو کەسانەی کە وەزارەتی داد دایان دەمەزرێنیٚ لە دادگاکانی عێراقی بە مەبەستی تبلیغ کردن.

**٢-موظفو البريد:**

واتا دادگا وەرەقەی تبلیغ دەکاتە ناو زەرفێکی ملەوەن بە ڕەنگێکی تایبەت بۆ ئەوەی بزاندریٚ کە ئەمە نامەیەکی دادگەریە، وە لەسەر غلافەکە ژمارەی دەعوا و ناوەرۆکی زەرفەکە و تاریخ و واژووی معاون قچائی دەنووسرێت لەگەڵ خەتمی دادگادا پاشان دەنێردرێت بۆ دائیرەی برید.

**٣-رجال الشرطة:**

پیاوانی پۆلیس هەڵدەستن بە ئەنجامدانی کاری تبلیغ کردن لە شوێنە دورەکان کە نوسینگەی بریدی تێدا نیە.

**دووەم /مدة التبليغ:**

یاسای مرافعات الزامی دادگای کردووە کە دەبیٚ ڕەچاوی شوێنی کاری یان نیشتەجیٚ بوونی داوالێکراو بکات پاشان ماوە بۆ یەکەم مرافعە (دانشتنی دادگا) دابنێت، هەروەها ڕەچاوی ئەوەش بکات کە داوالێکراو خۆی ئامادە بکات بۆ دیفاع کردن و سەفەر کردن و..... هتد، هەر بۆیە ماددەی (٢٢) لە هەمان یاسا ئاماژەی بەوە کردووە کە نابیٚ ئەو ماوەیەی لە نێوان تاریخی تبلیغ کردن و تاریخی مرافعە لە سیٚ رۆژ کەمتر بێت بە استثناى بابەتە پلەیەکان-

الامور المستعجله.

وئەگەر هات و ئەو کەسەی کە مەبەستە تبليغ بکرێت عێراقی بوو یان اجنبی بوو بەڵام لە دەرەوەی عێراق نیشتەجێ بوو ئەوە پێویستە ماوەی نێوان تاریخی تبلیغ کردن و تاریخی مرافعە لە پازدە (١٥) رۆژ کەمتر نەبێت و لە (٤٥) رۆژیش زیاتر نەبێت.

وئەگەر هات و رۆژی مرافعە کەوتە ناو پشوویەکی فەرمی یەوە ئەوا لەم کاتە رۆژی دواتر لە رۆژی پشووکە بە رۆژی مرافعە دادنرێت.

**اجراءات التبلیغ:**

مەبەست لە اجرائاتی تبلیغ ئەو ڕێسایانەیە کە یاسا دیاری کردووە بۆ چۆنێتی تبلیغ کردنی ئەو کەسانەی کە دەویسترێ تبیلغ بکرێن، لە ڕووی ئەوەی ئەو کەسە شخصێکی سروشتیە یان معنویە، یاخود شوێنی نیشتەجێ بوونی لە عیراقە یان لە دەرەوەیە. وە ئەمەش وا دەخوازێت ئەم خاڵانەی خوارەوە باس بکەین:

**یەکەم/ التبلیغ داخل العراق:**

**١- تبلیغ الشخص الطبیعی:**

**أ/ تبلیغ منتسبو الدولة:**

فەرمانبەرانی دەوڵەت و پیاوانی ئاسایش و پولیس تبیلغ دەکرێن لە ڕێگەی دامو دەزگاکانیان.

**ب/ تبلیغ ذوی المهن الحرة:**

تبلیغی ئەم کەسانە دەکرێن لە ڕێگەی شوێنی کاریان یان شوێنی نیشتەجێیان، وئەو کەسەی کە مەبەستە تبلیغ بکرێت دیار بوو ئەوە دەکرێ تبلیغ بکرێ لە هەر جێگایەك بینرا لە شوێنی گشتی یاخود لە جادە یان لە ماڵەوە ........هتد، بەڵام ئەگەر خودی خۆی ئامادە نەبوو ئەوە دەکرێ تبلیغەکە بدرێتە دەست ئەو کەسەی کە لەگەڵی کار دەکات یان لەگەڵی دەژێت وەکو ژن، منداڵ، باوك، دایك ......هتد، هەتا وەکو ئەو کەسە ممییز بوو ئەو دەکرێت تبلیغەکەی بدرێتی.

وئەگەر نەکرا تبلیغ بکرێت لە شوێنی نیشتەجێی یان کارکردنی ئەوە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە تبلیغ دەکات نسخەیەك لە وەرەقەی تبلیغ هەڵبواسێت لەسەر دەرگای شوێنەکە و ئاماژەی پێ بکات لە وەرەقەکە وە ئەمە بە تبیلغ دادنرێت.

**ج/ تبلیغ الوکلاء:**

مەبەستمان لێ یان وکلاء بالخصومە، وەکوە پارێزەران وە نوێنەری دامو دەزگای حکومی ..... هتد، ئەمانە لەو شوێنە تبلیغ دەکرێن کە دیاریان کردووە لە سەنەدی وکالەکە.

**د/ تبلیغ السجناء:**

تبلیغی بەندکراوەکان ومەوقوفەکان لە ڕێگەی بەریوەبەری بەندیخانە دەکرێت یاخود جێگرەکەی.

**ه/ تبلیغ الطلبة:** تبلیغ کردنی قوتابی دەکرێت لە ڕێگەی ڕاگری کۆلێژ یاخود پەیمانگە یان بەڕێوەبەری قوتابخانە یان لە ڕێگەی شوێنی نیشتەجێ بوونی.

**٢/ تبيلغ الشخص المعنوى:**

**أ/ تبليغ المؤسسات الرسمية:**

**ئەگەر ئەو کەسەی کە تبلیغ دەکرێت وەزارەتێك بوو یان دام ودەزگایەکی فەرمی ئەوە وەرەقەی تبلیغ دەنێردرێت بۆ ئەو وەزارەتە یان دەزگایە.**

**ب- تبليغ الشركات التجارية او المدنية والاشخاص المعنوية الخاصة:**

**تبليغ الشركات العراقية:**

**لەم حاڵەتە وەرەقەی تبلیغ دەدرێتە (مرکز اداره الشرکه)، یان یەکێ لە هاوبەشەکان یان بەڕێوەبەری کۆمپانیا یان لە شوێنی نیشتەجێی یەکێکیان.**

**تبليغ الشركات الاجنبية:**

**لەم حاڵەتە وەرەقەی تبلیغ دەدرێتە لقەکەی یان بریکارەکەی لە عێراق یان ممپلی تجاری.**

**تبيلغ الاشخاص المعنوية الخاصة:**

**لەم حاڵەتە وەرەقەی تبلیغ دەدرێتە جێگری بریکاری شەخصە مەعنەوێکە لە مەرکەزی ئیدارەکەی، وە ئەگەر مەرکەزی ئیدارەی نەبوو ئەوە دەدرێتە بریکارەکەی لە هەر شوێنێك بێت یان لە شوێنی نیشتە جێ بوونی.**

**دووەم: التبليغات خارج العراق:**

**١- العراقي او الاجنبي الذي يعمل في المؤسسات الرسمية العراقية في الخارج:**

**لەم حاڵەتەدا تبلیغەکە دەکرێت لە ڕێگەی وەزارەتی دەرەوە، پاش ئەوەی وەرەقەی تبلیغ بە ڕێگەی دەست یان بەریدی مسجل دەنێردرێت بۆ وەزارەتی دەرەوە.**

**٢- العراقي او الاجنبي الذي لا يعمل في المؤسسات الرسمية العراقي في الخارج:**

**لەم بارەیەوە یاسا جیاوازی لە نێوان دوو حاڵەت دەکات:**

**أ- ئەگەر هات و لە نێوان عیراق و ئەو وڵاتەی کە کەسەکەی تێدایە موعاهەدەیەك هەبێت بۆ هاریکاری دادگەری ئەوا لەم حاڵەتەدا تبلیغ دەکرێت بەو ڕێگەیەی کە موعاهەدەکە دیاری کردووە.**

**ب- بەڵام ئەگەر لە نێوانیاندا هیچ موعاهەدەیەك نەبێت بۆ هاریکاری دادگەری ئەوا لەم حاڵەتەدا کەسەکە تبلیغ دەکرێت بە ڕێگەی بریدی مسجل یان وەزارەتی دەرەوە.**

**بطلان التبليغ:**

**ماددەی (٢٧) لە یاسای مرافعاتی عیراقی دەڵێ: ((يعتبر التبليغ باطلاً اذا شابه عيب او نقص جوهري يخل بصحته او يفوت الغاية منه))، واتە تبلیغەکە باگل دەبێت ئەگەر عەیبێك یان نەقصێکی تێدا بوو کە وای دەکرد ئامانجی تبلیغ نەیێتە دی، وە بوونی عەیب لە تبلیغ وەکو دەفعێکی شکلی بەکار دێت.**

**المرافعة**

**حضور الخصوم وغيابهم**

**پێناسەی دادگایی حضوري (المحاكمة الحضورية): ئەو دادگایەیە کە هەموو لایەنەکانی دەعوا ئامادە دەبن لە مرافعە، وە ئەگەر یەکێ لە لایەنەکان تەنها بۆ جارێك ئامادە بوو پاشان ئامادە نەبوو ئەوە هەر دادگایەکە بە حضوري هەژمار دەکرێت.**

**پێناسەی دادگایی غیابی (المحاكمة الغيابية): ئەو دادگایەیە کە یەکێ لە لایەنەکانی دەعوا ئامادەی هیچ دانشتنێکی مرافعە نەبووە لە سەرەتاوە هەتا وەکو دەرچوونی حوکم لەگەڵ ئەوەی کە تبلیغێکی دروست کراوە.**

**وە چوار حاڵەتمان هەیە سەبارەت بە ئامادە بوون و ئامادە نەبوونی لایەنەکان:**

**یەکەم: حضور الطرفان:**

**ئەگەر هەر دوو لایەنی دەعوا ئامادە بوون ئەوا دادگا دەست بە تەمەشاکردنی دەکات پاش تأکید کردنەوە لە کەسایەتی هەر دوو لایەن، وە ئەو حوکمەی کە دەردەچێت لە کۆتایدا حوکمێکی حضوري دەبێت سەبارەت بە هەر دووکیان.**

**وە ئەو ئاسەوارەی کە ئەم حوکمە بەجێی دەهێڵێ ئەوەیە: دەکرێ تانە (طعن) لەم حوکمە بگیرێ بە هەموو ڕێگاکانی تانەگرتن تەنها بە ڕێگەی الاعتراض على الحكم الغيابي نە بێت.**

**دووەم: غیاب الطرفان:**

**دەعوای مەدەنی مافێکە بۆ لایەنەکانی نەك ئەرکێك بێت لەسەریان، بۆیە دادگا ناتوانێت ئیلزامی لایەنەکان بکات بۆ ئەوەی ئامادەبن لە مرافعە، وە ئەگەر هەر دوو لایەن ئامادە نەبوون ئەوا دادگا ناتوانێت تەمەشای دەعواکە بکات، بۆیە دادگا هەتا وەکو (١٠) ڕۆژ چاوەڕوانی دەکات، وە ئەگەر هیچ لایەنێك - داواکار و داوالێکراو- داوایان نەکرد لە دادگا کە بەردەوام بێت لە تەمەشاکردنی ئەوا دەعواکە بە حوکمی یاسا باطل دەبێت بە پێی ماددەی (٥٤) ی یاسای مرافعاتی عیراقی.**

**سێیەم: حضور المدعي وغياب المدعي عليه:**

**لەم حاڵەتەدا ئەگەر داوالێکراو تبلیغێکی دروست کرابوو ئەوا دەکرێ مرافعە دەست پێ بکات و دادگاش حوکم دەرکات بەوەی کە دەیبینێ دروستە، وجیاوازی نییە ئەگەر مرافعەکە لە دژی داوالێکراو بە شێوەیەکی حضوري بێت - ئەگەر بۆ جارێکیش بێت ئامادە بوو لە مرافعە لە پێشوتر - یان غیابی.**

**بەڵام دادوەر ناتوانێ لە ئامادە نەبوونی داوالێکراو ئەوە دەرەنجام بکات کە ئەمە ئیقرارێکە (دانپێنانێکە) بە مافی داواکار لە دەعوا، بەڵکو پێویستە لەسەر دادوەر بە چاکی ڕاوەستێت لەسەر قسەکانی داواکار وحوکم بدات بە پێی ئەو بەڵگانەی کە پێشکەشی دەکات. وە دادوەر مولزەمە کە بەو دفوعانە ببات کە لە نیزامی عامدایە وەکو نەبوونی ئیختصاصی وظيفي یان نوعی یان نەبوونی خصومە .... هتد.**

چوارەم: حضور المدعي عليه وغياب المدعي:

لەم حاڵەتەدا ئەگەر داواكار پێشوتر ئامادەبوو بێت لە یەکێ لە دانیشتنەکانی دادگا ئەوا مرافعەکە لە دژی بە حضوري ئەنجام دەدرێت، بەلأم ئەگەر لە هیچ دانشتنێك ئامادە نەبوو بێت ئەوا مرافعە لە دژی بە غیابی ئەنجام دەدرێت، وە لەم حاڵەتەدا داوالێکراوی ئامادەبوو دەتوانێ داوا لە دادوەر بکات کە:

١- ابطال کردنی عەریزەی دەعوا.

٢- یان تەمەشاکردنی ئەو دەفعەی کە بەرزی کردۆتەوە لە دژی دەعواکەی داواکار، وە لەم حاڵەتەدا دادگا تەمەشای دەعواکە دەکات بە پێ ی یاسا.

الوكالة بالخصومة

پێناسەی الوكالة بالخصومة: ئەو وەکالەیەیە کە ڕێگە بە بریکار دەدات بە ئەنجامدانی ئەو کار و ئیجرائاتانەی کە پارێزگاری لە ماڧ موکل دەکات، هەروەها بەرزکردنەوەی دەعوا و مرافعە هەتا وەکو کۆتایی و بەرزکردنەوەی ڕێگاکانی تانەگرتن إلاّ ئەگەر هات و سەنەدی وەکالەکە ڕێگەی پێ نەدا یاخود یاسا.

الشخص الذي يحق له ان يكون وكيلاً عن الخصوم:

١- المحامون، پارێزەران.

٢- الازواج والاصهار والاقارب حتى الدرجة الرابعة: ئەمانە بۆیان هەیە ئامادەی دانیشتنەکانی دادگا بن وەکو بریکاری یەکێ لە لایەنەکانی دەعوا لە داوای بەرایی هەتاوەکو (٥٠٠) دینار، هەروەها لە دەعوای باری کەسایەتی.

٣- النائب عن غيره في حالات معينة: یاسای مرافعات ڕێگەی داوە بە وەصی و وەلی و قییم و متولی ئامادەی دەعوای ئەوانەی لە ژێر دەستیانن بن بە هەمان مەرجی خاڵی دووەم.

٤- موظفو الدوائر الرسمية: نوێنەری دام ودەزگای حکومی دەتوانێ ئامادەی ئەم دەعوایانەی خوارەوە بێت بە مەرجێك بڕوانامەی بکالۆریۆسی هەبێ لە یاسا:

أ- ئەو دەعوایانەی کە دام ودەزگاکە لایەنێکە تیایدا وە بەهاکەی لە (٣٧٥٠٠٠٠) سێ ملیۆن حەفت سەد وپەنجا هەزار دینار زیاتر نییە.

ب- ئەو دەعوایانەی کە بەرز دەکرێتەوە لە نێوان دام ودەزگاکانی حکومی هەرچەندێ بێ بهاکەی.

انواع الوكالة بالخصومة:

١- الوكالة العامة بالخصومة: ئەو وکالەیەیە کە ڕێگە بە بریکار دەدات ئامادەبێت لە هەموو جۆرە دەعوایەك وە لە هەموو مەرحەلەیەکی دادگایکردن بۆ بەرژەوەندی موکل، بەلأم لەگەڵ ئەمەشدا ئەوا وەکالەی گشتی بە شێوەیەکی ڕەها ڕێگە نادات بە بریکاری گشتی ئەنجامی هەندێ کار بکات بەبێ تەفویزێکی تایبەت، بۆ نموونە ئەنجامی ئیقرار کردن بە مافێك یان تنازل کردن لێ ی یان ئەنجامدانی صلح یان تحکیم یان کڕین یان ڕهن یان بەکرێدان ........... هتد.

٢- الوكالة الخاصة بالخصومة: ئەو وەکالەیەیە کە ڕێگە بە بریکار دەدات ئامادەبێت لە دەعوایەکی دیاریکراو.

**عزل الوكيل وإعتزاله:**

**ماددەی (٥٣) ی یاسای مرافعاتی عیراقی ئاماژە بەوە دەکات کە دەکرێ بریکار واز لە وەکالەتەکەی بێنێت بە مەرجێك ئەم وازهێنانە بگاتە علمی موکل، هەروەها لە کاتێکی نا گونجاو نەبێت. هەروەها موکل دەتوانێ عزلی بریکار بکات وە دادگا ئاگادار دەکاتەوە کە بریکارێکی تر دادەنێت.**

**سماع الدعوى**

**یاسای عیراقی بابەتی رێکخستن و بەڕێوەبردنی دانیشتنەکانی دادگای داوەتە دەست دادوەر ئەگەر هاتوو دادگایەکە لە یەك دادوەر پێك هاتبوو، وە بە سەرۆکی دەستە ئەگەر دادگایەکە پێك هاتبوو لە دەستەیەکی دادگەری.**

**دادگا پێك دێت لە کاتی دەست بەکاربوونی لە دادوەرێك لەگەڵ یاریدەدەری دادوەری (معاون قضائي) کە هەڵدەستێ بە نووسینەوەی قسەی لایەنەکان وە رێکخستنی مەحزەری داواکە هەروەها هەموو ئەم کارانەی دەچێتە ژێر ئیشرافی دادوەر.وە دادوەر لەسەرییەتی یەکەم جار گوێ لە وتەکانی داواکار بگرێ پاشان داوالێکراو، وە پێویستە لەسەر دادگا هەموو وتەی لایەنەکانی داوا بنوسێتەوە لە مەحزەری دانیشتنەکە وە واژوو دەکرێ لەلایەن دادوەر و معاون قضائي و لایەنەکان یاخوود بریکارەکانیان پاشان دەپارێزرێت لە اضبارەی داواکە.**

**وەکو وتمان دادوەر پێویستە گوێ لە لایەنەکان بگرێ وە قسەکانیان نەپچرێنێ تەنها ئەگەر دەرچوون لە بابەتی داوایەکە یان سیستەمی دانیشتنەکەیان تێکدا یان قسەی ناشرینیان بە یەکتری دەوت، لەم کاتەدا دادوەر دەتوانێ ئەو لایەنە دەربکات لە دانیشتنی دادگا یان حوکم بدات بە حپس کردنی بۆ ماوەی (٢٤) کاتژمێر وە خستنە سەری غەرامەیەك کە لە دە (١٠) دینار زیاتر نەبێت، بەڵام دادوەر دەتوانێ پاشگەز ببێتەوە لەم حوکمە پێش تەواو بوونی دەوامی رەسمی.**

**وە ئەگەر هاتوو ئەو کردارەی کە یەکێ لە لایەنەکان ئەنجامیدا جریمەیەك بوو ئەوا دادگا فەرمان دەدات بە نوسینەوەی هەر تاوانێك روویداوە پاشان لێکۆلینەوەی بۆ دەکاتەوە وە دەتوانێ تاوانبارەکە رابگرێ.**

**تأجيل الدعوى دواخستنی داوا**

**ئەو ماوەیەی کە دانراوە بۆ یەکلایکردنەوەی داواکانی دادگاکانی پلە یەك بریتیە لە چوار مانگ دەست پێ دەکات لە تاریخی کۆتایی هاتنی تەبلیغات.**

**وە بنەمای گشتی لە دواخستنی داوا لە یاسای مرافعات ئەوەیە کە بە دوو شێوە دەکرێ :**

**یەکەم: قيام المحكمة في تلقاء نفسها بتأجيل الدعوى: واتە دادگا سەربەخۆ هەڵدەستێ بە دواخستنی داوا.**

**دووەم: موافقة المحكمة على التأجيل بناءً على طلب يقدم اليها من طرفي الدعوى أو احدهما: واتە رازی بوونی دادگا لەسەر دواخستنی داوا بە پێی ئەو داوایەی کەوا لێی کراوە لە لایەن هەردوو گرف یان یەکێکیان. وە لەم حاڵەتەدا دوو مەرج هەیە:**

**١- وجود سبب مشروع يقتضي التأجيل: واتە بوونی هۆکارێکی دروست بۆ دواخستنی داوا، وەکو ئەو داوایەی کە پارێزەر بەرزی دەکاتەوە بۆ دواخستنی داوایەکە لەبەر هۆی ئەوەی کە ماوەیەکی کەمە ئەم قەزیەی وەرگرتووە.**

**٢- لا يجوز التأجيل لذات السبب أكثر من مرة إلاّ إذا رأت المحكمة ما يقتضي ذلك لحسن سير العدالة: واته ناكرێ داوا دوابخرێ لەبەر هەمان هۆ بۆ زیاتر لە جارێك إلاّ ئەگەر دادگا بە باشی زانی دوابخرێ بۆ زیاتر بەدیهێنانی دادپەروەری، بۆ نموونە: ناکرێ هەمان پارێزەر داوای دواخستنی داوا بکات بە بیانووی ئەوەی کە ماوەیەکی کەمە ئەم قەزیەی وەرگرتووە بۆ جاری دووەم.**

**هەروەها ماددەی (٦٢) فەقەرە (٣) لە یاسای مرافعاتی عیراقی ئاماژە بەوە دەکات کە نابێ ماوەی دواخستن لە (٢٠) رۆژ زیاتر بێت إلاّ ئەگەر زەرورەت وای دەخواست کە دوابخرێت بۆ ماویەکی زیاتر.**

**الـدفـوع، داکـۆکـی**

**پ / پێناسەی دفوع چیە؟**

**وە/ مادەی (٨) لە یاسای مرافعاتی عیراقی پێناسەی دفوعی بەوە کردووە کە ﴿ هو الإتيان بدعوى من جانب المدعي عليه تدفع دعوى المدعي وتستلزم ردها كُلاً أو بعضاً ﴾، واتە هێنانەوەی داوا لەلایەن داوا لێکراو کە بەرپەچی داوای داواکار دەکات بە شێوەیەك کە هەمووی رەد دەکاتەوە یان هەندێکی.**

**پ / حیکمەی دفوع چیە ؟**

**وە/ حیکمەی دفوع دامەزراندنی تەوازونێکی دادپەروەرانەیە لە نێوان لایەنکانی داوا.**

**پ / مەرجەکانی دفوع چیە ؟**

**وە/ هەمان ئەو مەرجانەیە کە پێویستە بۆ وەرگرتنی داوا چونکە دفوعیش هەر داوایە وە مەرجەکانیش ئەمانەن :**

**١. أهليه. ٢. الصفه أو الخصومه. ٣. المصلحه. ٤. پەیوەندی هەبێ لە نێوان دفعەکە و داوا أصلیەکە.**

**پ / جۆرەکانی دفوع چیە ؟**

**وەلام/ سێ جۆرە دفوع هەیە کە ئەمانەن:**

**یەکەم : دفوع شکلیە:**

**ئەو جۆرە دفعەیە کە ئاراستەی ئیجرائاتی داواکە یان اختصاصی دادگا دەکرێ بێ ئەوەی ئاراستەی بابەتی یاخود مافی داواکە بکرێت، وە ئەم دفعانەش لە مادەکانی (٧٣ ــ ٧٧ ) لە یاسای مرافعاتی عیراقی باسکراوە. وە ئەم دەفعانەش دوو جۆرن : ـ**

**١- دفوع شكلية يلزم تقديمها قبل أي دفع آخر وإلاّ سقط الحق فيها:**

**پێویستە لەسەر داوالێکراو ئەم دەفعانە بەرزبکاتەوە لە یەکەم دانیشتنی دادگا پێش ئەوەی دادوەر بچێتە ناو ناوەڕۆکی داوایەکە یان مەرجەکانی وەرگرتنی، ئەگینا مافی ئەم دفعەی دەفەوتێ وە ناتوانێ لە مرحلەکانی تری دادگایکردنەکە بەرزبکاتەوە، هەروەها ئەم دەفعانە لە نیزامی عامدا نیە بۆیە پێویستە لەسەر داوالێکراو، کە لە بەرژەوەندیدایە، خۆی بەرزی بکاتەوە ئەگینا دادگا سەربەخۆ ئیسارەی ناکات، وەنموونە لەسەر ئەو جۆرە دەفعانە:**

الدفع ببطلان التبليغات.

الدفع بعدم الإختصاصي المكاني.

٢- دفوع شكلية يمكن تقديمها في أية مرحلة من مراحل الدعوى:

ئەم جۆرە دەفعانە لە نیزامی عامدایە بۆیە دەکرێ باس بکرێت و بەرزبکرێتەوە لە بەرامبەر هەموو جۆرە دادگایەك وە لە هەموو مرحلەیەکی دادگایکردن، هەروەها دادگا دەتوانێ سەربەخۆ ئەم دەفعانە ئیسارە بکات، وە نموونە بۆ ئەم دفعانەش ئەمانەن:

أ/ الدفع بتوحيد الدعويين: ماددەی (٧٥) لە یاسای مرافعاتی عیراقی ئاماژە بەوە دەکات کە ئەگەر هاتوو دەرکەت بۆ دادگا کە ئەم دعوایە پەیوەندی (إرتباط) هەیە بە دەعوایەکی تر بەرزکراوەتەوە لە بەرامبەر دادگایەکی تر ئەوا لەم حاڵەتەدا دادگا دەتوانێ بڕیار بدات بە یەك خستنەوەی هەردوو داوایەکە وە إچبارەی دەعوایەکە بنێرێت بۆ دادگاکەی تر، وە ئەگەر هاتوو ئەو دادگایەی ئەخیری بڕیاریدا بە ڕەفزکردنی یەکخستنی هەردوو داوا ئەوا ئەم بڕیارە دەکرێ تەمییز بکرێتەوە.

ب / الدفع بعدم جواز اقامة الدعوى في أكثر من محكمة واحدة: مادەی (٧٦) لە یاسای مرافعاتی عیراقی ئاماژە بەوە دەکات کە ناکرێ یەك داوا بەرزبکرێتەوە لە بەرامبەر زیاتر لە دادگایەك، وە ئەگەر هاتوو بەرزکرایەوە لە بەرامبەر دوو دادگا ئەوا عریزەی یەکەم وەردەگیرێ وە ئەوەی دووەم باگل دەبێت.

ج / الدفع بعدم الإختصاصي الولائي أو الوظيفي أو النوعي: مادەی (٧٧) لە یاسای مرافعاتی عیراقی ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم دەفعانە لە نیزامی عامدایە وە دادگا سەربەخۆ حوکمی پێ دەکات وە لە هەموو مرحلەکانی داوا.

دووەم : الدفوع الموضوعية:

ئەو دەفعەیە کە ئاراستەی خودی ئەو مافە دەکرێت کە کێشەی لەسەرە وە داوا دەکرێت، وەکو ئەوەی کە داوالێکراو ئینکاری بوونی گرێبەست بکات لەگەڵ داواکار یان دەست بەوە دەگرێ کە عقدەکە باطلة لەبەر بوونی عەیبێك لە عیوبی ئیرادە، وە ئەگەر دەفعی موضوعی ڕاست دەرچوو وە دادوەر پێی برد ئەوا ئەو ئاسەوارەی کە لێی دێتە کایەوە بریتی یە لە ڕەفزکردنی وەرگرتنی بابەتی داوایەکە کە لە عریزەکە هاتووە هەمووی یان بەشێکی، وە ئەم جۆرە دەفعانە ناکرێ حەصر بکرێ وە دەتوانرێت بەرزبکرێتەوە لە هەموو مرحلەکانی داوا، بەڵام زانایان جیاوازن سەبارەت بەوەی ئایا دادوەر سەربەخۆ دەتوانێ باسی ئەم دفعانە بکات یاخود نا؟

سێیەم: الدفوع بعدم قبول الدعوى:

ئەو دەفعەیە کە داوالێکراو ئینکاری دعوای داواکار دەکات لەسەر بنچینەی نەبوونی مەرجەکانی وەرگرتنی داوا، جا بە هۆی نەبوونی سیفە یان ئەهلیە یان مصلحە بێ، بۆیە ئەم دەفعە پەیوەندی نیە بە لایەنی شکلی داوایەکە وەنە بەلایەنی موچوعی وە بابەتی داواکە، وە ئەم دەفعانە لە نیزامی عام دایە بۆیە دەکرێ بەرزبکرێتەوە لە هەموو مرحلەکانی داوا هەروەها دادگا دەتوانێ سەربەخۆ ئیسارەی بکات، وە ئەگەر ئەم دەفعە ڕاست دەرچوو وە دادگا پێی برد ئەوا دادوەر حوکم دەردەکات بە ڕەدکرنەوەی دەعوا نەوەك ابطال کردنی.

**الدعوى الحادثة، داوای نویٚ**

**پیٚناسەی ( الدعوى الحادثة):**

**((هي الدعوى التي تقدم للمحكمة أثناء نظر الدعوى الاصلية وتؤدي الى تعديل نطاقها من حيث الموضوع أو السبب أو الاشخاص))، واتە ئەو داوایەیە کە بەرزدەکریٚتەوە بۆ لای دادگا لە کاتی تەماشاکردنی دەعوای اصلی یەکەم وە دەبیٚتە هۆی گۆرانی چوارچیٚوەی دەعوا اصلیەکە لە رووی بابەت و هۆکار و کەسەکان.**

**جۆرەکانی دعوی حادثة:**

**یەکەم / الدعوى المنضمة: ئەو داوایەیە کە لە لایەن داواکارەوە بەرز دەکریٚتەوە.**

**دووەم / الدعوى المتقابلة: ئەو داوایەیە کە لە لایەن داوالیٚکراوەوە بەرز دەکریٚتەوە.**

**سیٚیەم/ دخول أو إدخال شخص ثالث في الدعوى.**

**یەکەم/ الدعوى الحادثة المنضمة:**

**یاسای مرافعاتی عیراقی باسی سیٚ جۆری ئەم داوایانەی کردووە کە ئەمانەن:**

**١- الطلبات المكملة للدعوى الاصلية: بۆ نموونە داواکار داوایەك بەرزدەکاتەوە بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەکەی لە داوالیٚکراو پاشان داوایەکی حادثة بەرزدەکاتەوە بۆ وەرگرتنەوەی فوائدی قەرزەکەش.**

**٢- الطلبات المترتبة على الدعوى الاصلية: بۆ نموونە داواکار داوای قستەکانی قەرزەکەی دەکاتەوە کە کاتیان هاتووە لە کاتی تەماشاکردنی دعواکە.**

**٣- الطلبات المتصلة بالدعوى الاصلية إتصالاً لا تقبل التجزئة: بۆ نموونە بەکریٚدەر (واتە ئەو کەسەی شت بەکریٚ دەدات) داوای فسخی گریٚبەستی بەکریٚدان دەکات هەروەها داوای کریٚیەکەش دەکات.**

**دووەم / الدعوى الحادثة المتقابلة:**

**یاسای مرافعاتی عیراقی باسی دوو ویٚنەی ئەم داوایانەی کردووە ئەمانەن:**

**١- طلب المقاصة: المقاصة هي اسقاط دين مطلوب لشخص من غريمه في مقابلة دين من ذلك الشخص لغريمه، وە مقاصەش دوو جۆرە:**

**یەکەمیان: پیٚی دەوتریٚ مقاصەی یاسایی کە پیٚشکەش دەکریٚ وەکو دفعیٚکی موچوعی، وە دووەمیان: پیٚی دەوتریٚ مقاصەی دادگەری وەئەمەش بەرزدەکریٚتەوە وەکو دعوای حادپە متقابلە.**

**٢- اي طلب يكون متصلا بالدعوى الاصلية اتصالا لا يقبل التجزئة: واتە هەر داوایەك کە بەستراوە بە داوا ئەصلیەکە بە شیٚوەیەك ناکریٚ لیٚی جیابکریٚتەوە، بۆ نموونە/ داواکار دەعوای قەرەبوو کردنەوە بەرز دەکاتەوە لە دژی داوالیٚکراو لەبەر ئەوەی ئۆتومبیٚلەکەی دعمی کردووە لەگەلٚ ئۆتومبیلەکەی داواکار، بەلاٚم داوالیٚکراویش دعوایەکی متقابلە بەرز دەکاتەوە لە دژی داواکار داوای قەرەبوو کردنەوەی ئەو زەرەرانە دەکاتەوە کە توشی بووە لە دەرەنجامی ئەم دعمە.**

سێیەم / دخول أو إدخال شخص ثالث في الدعوى:

هەندێ جار کەسی سێیەم دێتە ناو داواکەوە،جگە لە داواکار و داوالێکراو، وە ئەمەش لەم حاڵەتانەی لای خوارەوە دەبێ:

١- التدخل الاختیاری: وەئەمەش دەکرێ بە دوو بەشەوە:

ا. التدخل الاختياري الانضمامی:

بریتیە لە تدخل کردنی کەسێك لە داوایەك بۆ بەرژەوەندی یەکێ لە لایەنەکانی داوا وە داکۆکی کردن لەمافەکانی، بەڵام ئەم کەسە لە راستیدا بەرژەوەندی خۆی هەیە لەم تدخلە، بۆ نموونە/ تدخل کردنی دائن لە داوای مدینەکەی بە مەبەستی داکۆکی کردن لە مافەکانی، وە ئەم جۆرە تدخلە دەکرێ لە هەموو مرحلەیەك لە مراحلەکانی داوا جگە لە مرحلەی تمیز نەبێ، وە ئەگەر دادوەر رازی بوو لەسەر تدخل کردنی ئەوا کەسی سێیەم دەبێتە لایەنێك لە داوایەکە بەڵام لایەنێکی پاشکۆ بۆ ئەو لایەنەی کە پشتی دەگرێ.

ئەو ئاسەوارانە چین ئەگەر هاتوو متدخل وەکو تەرەفێك (لایەنێك) بێت لە دەعوا ؟

١- کەسی متدخل بۆی بۆی نیە ئەنجامی کردارێك یاخود ئیجرائاتێك بکات کە دژی بێ وە نەگونجێ لەگەڵ ئەوەی کە لایەنێکە لە دعوی، بۆ نموونە/ بۆی نیە شایەدی بدات لەم دعوایە.

٢- کەسی متدخل بۆی نیە تانە بگرێ لەو حوکمەی کە دەرچووە بە رێگەی اعتراض الغیر، بەڵکو دەتوانێ بە رێگاکانی تر تانە بگرێ، چونکە خۆی تەرەفێکە لەداوا.

پ / ئەو ئاسەوارانە چین کە ئەگەر هاتوو کەسی متدخل وەکو لایەنێکی پاشکۆ بوو لە داوا ئەصلیەکە؟

١- چ حوکمێك دەربچێ بەرامبەر لایەنی ئەصلی ئەوا کەسی متدخلیش دەگرێتەوە چونکە پاشکۆی لایەنە ئەصلیەکە.

٢- بۆ کەسی متدخل نیە مەوقفێك بنوێنێ کە دژبێ لەگەڵ مەوقفی لایەنە ئەصلیەکەی کە چۆتە پشتیەوە.

٣- ئەگەر داواکە بەتاڵ کرایەوە یان رەد کرایەوە ئەوا حوکمەکە کسی متدخلیش دەگرێتەوە بە پاشکۆیی.

التدخل الاختیاری الاختصامي:

واتە کەسی سێیەم داوا بەرز دەکاتەوە دژی هەموو لایەنە ئەصلیەکانی دەعواکە نەوەك لە بەرژەوەندی لایەنێك وە داوای هەمان ماف دەکات لە داوا ئەصلیەکە یان مافێکی تر کە پەیوەندی پێ هەیە، نموونە لەسەر حالەتی یەکەم/ کێشەیەك هەیە لە نێوان (أ . ب) دەربارەی مولکیەتی خانویەك وە (ج) تدخل دەکات لە دژی (أ . ب ) داوای مولکیەتی خانوەکە دەکات بۆ خۆی، وە نموونە بۆ حاڵەتی دووەم (ج) تدخل دەکات لە داوایەك کە بەرزکراوەتەوە لە نێوان (أ . ب) وە داوای قەرەبوو کردنەوە دەکات لێیان بە هۆی ئەو زەرەرەی کە لێی کەوتووە بە هۆی قسەکانیان یان وتەکانیان کە وەکو تەشهیرێك بووە بۆ (ج).

وە ئەم تدخلە بە ئیزنی دادگا دەبێت، وە لایەنەکانی داوا ئەصلیەکە دەتوانن اعتراض بگرن لەسەر ئەم تدخلە لە بەرامبەر هەمان دادگا، وە ئەگەر دادگا رازی بوو لەسەر تدخلەکە ئەوا کەسی سێیەم دەبێتە لایەنێك لە داوایەکە.

**مەرجەکانی وەرگرتنی التدخل الاختیاری الاختصاصی ئەمانەن :**

1. **دەبێ تدخلەکە بکرێت لەسەر هەمان مافی داوا ئەصلیەکە یان مافێکی تر کە پەیوەندی پێوە هەیە.**
2. **نابێ کەسی متدخل یەکێك بێت لە لایەنەکانی داوایەکە یان خەلەفی خاص یا عامی یەکێك لە لایەنەکان بێت.**
3. **نابێ مەبەست لە تدخل کردن تەنها بەسەربردنی کات و دواخستنی یەکلایکردنەوەی داوایەکە بێت.**
4. **دەبێت تدخلەکە لە دژی هەر دوو لایەنی داوایەکە بێت نەوەك یەك لایەن.**

**التدخل الاجباری:**

**التدخل الاجباری بناءً علی طلب اطراف الدعوی:**

**واتە داوا لە کەسێك دەکرێ کە لە دەرەوەی داوایەکەیە بێتە ناو داوایەکە لەسەر داوای یەکێك لە لایەنەکانی داوا ئەصلیەکە پاش رەزامەندی دادگا لەسەری، وە ئاسەواری ئەم تدخلە ئەوەیە:**

**١- کەسی متدخل دەبێتە خەصمێك لە داوایەکە وەلایەنێك تیایدا بۆیە پێویستە ئامادەبێ لە دانیشتنەکانی دادگا وە بە پێچەوانەوە دادگا بە غیابی حوکمی لەسەر دەدات.**

**٢- بۆ کەسی متدخل هەیە دەست بگرێ بە دفوعی موضوعی وشکلی لەسەر داوایەکە بە مەرجێك نابێ ئەو دەفعە داوالێکراو پێشتر بەرزی کردبێتەوە وە دادگا یەکلایی کردبۆوە.**

**٣- ئەو دلیل و بەڵگانەی کە باس کراوە لە داوایەکە نابنە بەڵگەیەك لە دژی متدخل وە پەیوەندی پێوە نیە، بەلأم متدخل دەتوانێ سوود لەو دلیل و بەڵگانە وەربگرێ بۆ بەهێزکردنی مەوقفەکەی.**

**٤- ئەو حوکمەی کە دەردەچێت لە داوایەکەیان دەبێتە حوجەیەك وە بەڵگەیەك بۆی یان لە دژی.**

**التدخل الاجباری بناءً علی طلب المحکمة في تلقاء نفسها:**

**وە ئەمەش بە دوو شێوە دەبێت:**

**١- الحالە الوجوبیە: واتە دادگا لەسەرێتی و مولزمە کە کسێکی تر بێنێتە ناو داواکەوە، ئەمەش لە هەندێ داوا هەروەکو لە مادده (٦٩) فقره (٣) لە یاسای مرافعاتی عیراقی باسکراوە، بۆ نموونە/ (أ) کرێچیە وە (ب) کێشەیەکی هەیە لەگەڵ (أ) سەبارەت بەو خانوەی کە بە کرێی گرتووە لێرەدا پێویستە لەسەر دادگا (ج) یش کە بەکرێدەرە بێنێتە ناو داوایەکە.**

**٢- الحالە الجوازیە: ماددەی (٦٩) فقرە (٤) لە یاسای مرافعاتی عیراقی ئاماژە بەوە دەکات کە دادگا بۆی هەیە بانگی هەر کەسێك بکات بۆ وەرگرتنی زانیاری لێی کە ببێتە مایەی ئاسانکاری یەکلایکردنەوەی داوایەکە.**

**شروط قبول الدعوی الحادثة:**

**١- <u>الارتباط</u>: واتە دەبێ پەیوەندیەك هەبێ لە نێوان داوا اصلیەکە و داوا حادیپەکە، بۆ نموونە/ داوا اصلیەکە قەرزە وە داوا حادیپەکە فوائدی ئەم قەرزەیە.**

**٢- <u>الاختصاص</u>: واتە دەبێ داوا حادیپەکە لە ژێر اختصاصی دادگاکە بێت لە رووی اختصاصی وەزیفی و نوعی، چونکە ئەم اختصاصانە لە نیزامی عام دایە، بەلأم دەکرێ دادگایەك تەماشای داوایەکی حادیپە بکات ئەگەر هاتوو**

له ژێر اختصاصی مكانیش نەبوو چونكە ئەم اختصاصە لە نیزامی عام دانیە.

٣- **ان لا تكون الغرض من الدعوى الحادثة اطالة النزاع**: واتە ئەگەر دادگا هەستی كرد كە هیچ بەرژەوەندیەكی جدی نیە لە دعوای حادیپەكە بەڵكو تەنها مەبەستیان تاخیر كردنی دعوایەكەیە ئەوا دادگا بریار دەدات بەرەدكردنی داوا حادیپەكە وە بەردەوام دەبێ لە تەماشاكردنی داوا اصلیەكە، ئەمە هەروەكو لە مادەی (٧١) لە یاسای مرافعاتی عیراقی دا هاتووە.

**دفع الرسم**: وەكو بنەمایەكی گشتی پێویستە بۆ هەرداوایەك رەسم بدرێت، بۆیە لە حاڵەتی داوای منچمە و داوای متقابلە پێویستە رەسمی قچائی بدرێ، بەلاٌم لە حاڵەتی تدخل أو إدخال شخص پالپ فی الدعوى ئەگەر هاتنە ناو داوایەكە لەسەر داوای یەكێ لە لایەنەكان بوو ئەوا ئەم لایەنە رەسمی داوایەكە دەدات، بەلاٌم ئەگەر هاتوو تدخلەكە لەسەر داوای خودی دادگا بوو ئەوا هیچ رەسمێكی ناكەوێ.

**الحكم في الدعوى الحادثة:**

دەكرێ دەعوای حادپە بەرزبكرێتەوە پێش تەواوبوونی دانیشتنەكانی دادگا لە دعوى اصلیەكە، وە هەر داوا حادپەیەك ئەگەر پێشكەشكرا دوای تەوابوونی دانیشتنەكانی دادگا ئەوا بە باگل حسیب دەكرێ.

وە دانیشتنەكانی دادگا وا حسیب دەكرێ كە كۆتایی هاتووە ئەگەر داوایەكە ئامادەبوو بۆ دەرچوونی حوكم لەسەری لەلایەن دادگاوە لەهەمان رۆژ یان دادگا رۆژێكی تر دیاری دەكات بە مەرجێك نابێت لە (١٥) رۆژ زیاتربێت دوای رۆژی كۆتایی هاتنی دانیشتنەكانی دادگا.

**پ/ چۆن دادگا حوكم دەردەكات لە هەردوو داوای اصلی و حادیپە ؟**

وەلام / پێویستە لەسەر دادگا ئەوەندەی لە تواناداهەیە لە هەردوو داوا اصلیەكە و حادپەكە یەكلایی بكاتەوە بە یەك حوكم بە مەرجێ لە اختصاصی خۆی دەرنەچێ، ئەمە وەكو اصل، بەلاٌم وەكو استپنا و دوو حاڵەتمان هەیە:

**یەكەم**: ئەگەر داوا اصلیەكە ئامادەبوو بۆ حوكم بەلاٌم داوا حادپەكە پێویستی بە لێكۆلینەوەیەكی تازەی دەكرد ئەوا لەم حاڵەتەدا دادگا حوكم دەردەكات سەبارەت بە داوا اصلیەكە، وە دەست بە لێكۆلینەوە دەكات سەبارەت بە داوا حادپەكە پاشان حوكمێكی تایبەتی بۆ دەردەكات.

**دووەم**: وە ئەگەر هاتوو یەكلایكردنەوەی داوا اصلیەكە راوەستا بوو لەسەر یەكلایكردنەوەی داوا حادپەكە ئەوا دادگا یەكەم جار داوا حادپەكە یەكلایی دەكاتەوە پاشان حوكم دەردەكات لەسەر داوا اصلیەكە.

**الاحوال الطارئة في الدعوى**

**یەكەم: وقف المرافعة ( وەستاندنی دانیشتنەكانی دادگا ):**

**وقف المرافعە**: بریتیە لە بریارێكی دادگەری كە بە هۆیەوە دادگا رادەوەستێت لە تەمەشاكردنی دەعواكە ماوەیەك، وە ئەمەش لە دوو حاڵەت دەبێ:

**١- وقف المرافعە باتفاق الخصوم ( وەستاندنی دانیشتنەكانی دادگا بە رێكەوتنی هەموو لایەنەكان ):**

ماددەی (٨٢) لە یاسای مرافعاتی عیراقی ئاماژە بەوە دەكات كە دەكرێ دەعوا رابگیرێت ئەگەر لایەنەكان رێكەوتن

لەسەر وەستاندنی دەعواکە ماوەیەك کە لە (٣) سێ مانگ تێ نەپەڕێ لە مێژوی دان پێنانی دادگا بۆ ڕێکەوتنەکەیان.
وە ئەو هۆکارانەی کە دەعواکە رادەگرێ لەم حاڵەتەدا زۆرن، بۆ نموونە: لەوانەیە لایەنەکانی دەعوا بیانەوێت کێشەکەیان لە ڕێگەی صولح یان مفاوضات یەکلایی بکەنەوە بە شێوەیەکی ئاشتیانە.
ویاسا دوو مەرجی داناوە بۆ وەرگرتنی ئەم راگرتنە کە ئەمانەن:
أ- ڕێکەوتنی هەموو لایەنەکانی دەعواکە لەسەر داوای راگرتنی مرافعە، وە ئەم ڕێکەوتنە دەبێ بەردەوام بێ بە درێژایی ماوەی وەستاندنی دانیشتنەکانی دادگا (وقف المرافعە).ب- ماوەی ڕاگرتنی مرافعە لە (٣) مانگ زیاتر نەبێ لە مێژوی دان پێنانی دادگا لەسەر ئەم ڕاگرتنە، بۆیە ئەگەر لایەنەکان نەگەڕانەوە بۆ دادگا دوای (١٥) ڕۆژ لە کۆتایی هاتنی ماوەی راگرتنەکە ئەوا عەریزەی دەعواکە ابگال دەبێت.

٢- وقف المرافعە بقرار من المحکمە ( وەستاندنی دانیشتنەکانی دادگا بە بڕیاری دادگا):
ماددەی (٨٣) لە یاسای مرافعاتی عیراقی ئاماژە بەوە دەکات ئەگەر دادگا بینی کە حوکم کردن لەسەر دەعوایەکی دیاری کراو ڕاوەستا بوو لەسەر یەکلایی کردنەوەی بابەتێکی تر ئەوا لەم حاڵەتەدا دادگا قرار دەدات بە راوەستاندنی دانیشتنەکانی دادگا هەتاوەکو ئەو بابەتە یەکلایی دەکرێتەوە، پاشان دەست دەکرێتەوە بە تەمەشاکردنی دەعواکە لەو خاڵەی کە ڕاوەستابوو لێی، وە دەکرێ تانە بگیرێ لەم قرارەی دادگا بە ڕێگەی تمییز.

دووەم/ پچرانی دانیشتنەکانی دادگا (انقطاع المرافعة):
دەکرێ هەندێ جار دادگا ڕابوەستێ لە تەمەشاکردنی دەعواکە ماوەیەك لەبەر چەند هۆیەك کە جیاوازە لە هۆیەکانی وقف المرافعە، ودانیشتنەکانی دادگا دەپچرێ لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:
١- وفاة احد الخصوم (مردنی یەکێ لە لایەنەکان):
ماددەی (٨٤) ی یاسای مرافعاتی عیراقی ئاماژە بەوە دەکات کە دانیشتنەکانی دادگا دەپچرێ بە حوکمی یاسا بە مردنی یەکێ لە لایەنەکانی دەعوا یان بە لە دەست دانی ئەهلیەتی خصومە تەنها ئەگەر دەعواکە ئامادەبوو بۆ حوکم دان بەسەر بابەتەکەیدا ئەوا لەم حاڵەتەدا مرافعەکە ناپچرێ، بۆیە ئەگەر یەکێ لە لایەنەکان مرد ئەوا مرافعەکە دەپچرێ هەتاوەکو قسامی شەرعی بۆ دەردەکرێ وە یەکێ لە میراتگرەکان ئامادە دەبێ ئەوکاتە دادگا دەست بە دانیشتنەکانی دەکاتەوە لەو خاڵەی کە ڕاوەستابوو لێی.
٢- فقد احد الخصوم لاهلیتە (لە دەست دانی ئەهلیەتی یەکێ لە لایەنەکان):
ئەگەر یەکێ لە لایەنەکانی دەعوا ئەهلیەتی لە دەستدا بە هۆی نەخۆشیەکی عەقلی یان بەند کردن، یان افلاس یان هەر هۆیەکی تر، ئەوا لەم حاڵەتەدا مرافعە دەپچرێ بەڵام دەست پێ دەکاتەوە بە ئامادەبوونی نوێنەری کە قەییمە یان وەلیە یان امین التفلیسەیە.
٣- زول الصفة التي کان یباشر لها الخصومة احد الاشخاص نیابة عن غیرە:
بۆ نموونە نەمانی سیفەتی وەصی یان قییم یان وەلی یان وەزیری تەندروستی اضافةً الی وظیفتە، لەم حاڵەتەدا

دانیشتنەکانی دادگا دەپچڕێ هەتاوەکو وەصی یان وەلی یان قییم یان وەزیرێکی تر دادەنرێ.

**پ/ ئەو ئاسەوارانە چین کە دێتە کایەوە لە ئەنجامی پچرانی مرافعە؟**

**وەڵام:**

١- وەستاندنی هەموو کاتە یاساییەکان - المدد القانونیە- چ موددەی تقادم بێت یان اسقاط، کە خۆی دەبوایە بەردەوام بێت لە بەرامبەر لایەنەکان.

٢- باطل بوونی هەموو ئەو ئیجراوانەی کە دەکرێ لە کاتی پچڕانەکە.

**استثناء/ حالة وفاة الوکیل:**

ماددەی (٨٥) ی یاسای مرافعات ئاماژە بەوە دەکات کە دانیشتنەکانی دەعواکە ناپچرێ بە مردنی بریکار یان بە کۆتایی هاتنی بریکارییەکەی بە عزل یان اعتزل، وە بۆ دادگا هەیە کە دەرفەتێکی گونجاو ببەخشێ بەو کەسەی کە بریکارەکەی لە دەست داوە هەتاوەکو کارەکانی خۆی رێك دەخات.

وە ئەگەر ماوەی پچرانی دەعوا زیاتر بوو لە شەش مانگ بەبێ عوزرێکی مشروع، وە دانیشتنەکانی دادگا دەستی پێ نەکردەوە لەو ماوەیەدا ئەوا عەریزەی دەعواکە ابگال دەبێت بە حوکمی یاسا.

**سێیەم/ تنازل المدعي او ابطال عريضة الدعوى (تەنازول کردنی داواکار یان باتڵ بوونی عەریزەی داوا):**

**١- تنازل المدعي عن الحق:**

**کە ئەمەش دوو خاڵ لە خۆ دەگرێ:**

**أ- التنازل عن ورقه أو إجراو فى الدعوى:**

بۆ لایەنەکان هەیە تنازل بکەن لە وەرەقەیەك کە پێشکەشی دادگا کراوە یان تنازل بکەن لە ئیجرائێك تیایدا، وە لەم حاڵەتەدا وا حساب دەکرێ کە ئەو وەرەقەیە یان ئەو ئیجرائاتە هەر بوونی نەبووە ئەصلەن.

**پ/ مەرجەکانی تنازل کردن چیە ؟**

وەڵام: بە پێی ماددە (٢٠) لە یاسای سەلماندن ئەوا تنازل ئەم مەرجانەی لای خوارەوە پێویستە:

١- رەزامەندی دادگا لەسەر سحب کردنەوەی ئەو سەنەدەی کەوا پێشکەشی دادگای کردووە.

٢- وێنەیەکی مصدق لەو وەرەقەیە بپارێزرێت لە إچبارەی داواکە.

٣- وە لە هەموو کاتێکدا ناکرێت سحبی سەنەدێك بکرێتەوە ئەگەر هاتوو رۆلێکی یەکلاکەرەوە و کاریگەری هەبوو لەسەر یەکلایکردنەوەی داواکە ئیلا لە دوای دەرچوونی حوکمێکی (بات) یان قرارێك بە ابگال کردنی داواکە.

٤- ئەو لایەنەی کە وەرەقەکەی پێشکەش کردووە بۆی نیە سحبی بکاتەوە پاش ئەوەی لایەنی بەرامبەر تانەی لێ بگرێت کە ساختەیە وە دادگا بریاری دابوو رەوانەی دادوەری لێکۆلینەوە بکات.

**ب- التنازل عن الحكم:**

**دەکرێت ئەو لایەنەی کە حوکمەکەی لە بەرژەوەندی دەرچووە تنازول بکات لە حوکمەکە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە تنازول کردنە لەسەر ئەو مافەی کە سەلمێنراوە تیایدا، وە بۆی نیە جارێکی تر داوایەکی نوێ بەرزبکاتەوە وە داوای هەمان ماف بکاتەوە کە تنازولی لێ کردبوو.**

**٢- إبطال عريضة الدعوى:**

**داواکار دەتوانێ لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی مرافعە داوای إبگال کردنی عەریزەی داواکە بکات، چونکە داوا مافێکە بۆ داواکار، تەنها لە حالەتێکدا نا توانێ ئەویش ئەگەر داواکە ئامادەبوو بۆ دەرچوونی حوکم لەسەری، وە ئەگەر دادگا بریاری دا بە إبگال کردنی عەریزەی داوا لەسەر داوای داواکار ئەوا وا حیساب دەکرێت کە ئەو عەریزەیە بوونی نەبووە لە بنەرەتدا، بەلاَم داواکار دەتوانێ داوایەکی تازە بەرزبکاتەوە سەبارەت بە هەمان بابەت چونکە مافەکە سقوگ ناکات لە إبگال کردنی عریچەی داوا.**

**الحكم القضائي**

**پێناسە: حوکمي قضائي بریتیە لە بڕیارێکی کۆتایی کە دادگا دەری دەکات بە پێی ڕێساکانی یاسای مرافعات وبە هۆیەوە ئەو کێشەیەی کە بەرزکراوەتەوە بۆ بەرامبەر دادگا یەکلایی دەکرێتەوە.**

**پ/ جیاوازی چی یە لە نێوان حوکم و قرار؟**

**وە/ ١- حوکم بریتیە لە بڕیارێکی کۆتایی کە دادوەر دەری دەکات بۆ یەکلایی کردنەوەی ئەو کێشەیەی بۆی بەرز کراوەتەوە، بەلاَم قرار ئەو بریارەیە کە دادوەر دەری دەکات لە کاتی تەمەشاکردنی کێشەکە وەکو یارمەتی دەرێك بۆ یەکلایی کردنەوەی داواکە.**

**٢- حوکوم لە ئەسڵی ئەو مافە دەکۆڵێتەوە کە کێشەی لەسەرە، بەلاَم قرار لە ئەسڵی ئەو مافەی کێشەی لەسەرە ناکۆلێتەوە.**

**٣- دادوەر بۆی نیە لە حوکوم پاشگەز ببێتەوە پاش ڕاگەیاندنی، بەلاَم دادوەر بۆی هەیە لە قەرارەکەی پاشگەز بێتەوە بە مەرجێ باسی هۆیەکەی بکات لە مەحزەری داواکە.**

**٤- حوکوم پێویستی بە تەبلیغات هەیە، بەلاَم وەکو بنەمایەکی گشتی قرار پێویستی بە تەبلیغات نییە.**

**٥- حوکوم کە دەرچوو دەکرێ تانەی (طعن) لێ بگیرێ، بەلاَم قرار تانەی لێ ناگیرێ بە تەنهایی بەڵکو لەگەڵ حوکمەکەدا، تەنها ئەو قرارانە نەبێ کە ماددەی (٢١٦) ی یاسای مرافعات باسی کردووە.**

**دابەشکاریەکانی ئەحکام ( تقسیمات الاحکام )**

**یەکەم/ الاحکام الباتة والاحکام غير الباتة:**

**حوکمی غیر بات ئەو حوکمەیە کە دەکرێ تانەی لێ بگیرێ بە هەر ڕێگایەك لە ڕێگاکانی تانە گرتن. بەلاَم حوکمی بات ئەو حوکمەیە کە ناکرێ تانەی لێ بگیرێ بە هیچ ریگایەك لە ڕێگاکانی تانە گرتن. وە حوکم دەگاتە پلەی بات**

لەم حاڵەتانەی خوارەوە:

١- ئەگەر تانە گیرا لە حوکمەکە بە ڕێگەی ئیستئناف و تەمییز تەصحیح بەڵام ئەم تانانە رەد کرانەوە وە حوکمەکە پشت راست کرایەوە.

٢- ئەگەر حوکوم لەسەر دراو (المحکوم علیه) ئاگادار کرایەوە لە حوکمەکە بەڵام تانەی لێ نەگرت وە ماوەی تانەکە تێپەری.

٣- ئەگەر حوکوم لەسەردراوەکان ماف تانەگرتنیان سقوط بکەن بە ڕێکەتنی هەموویان.

٤- ئەگەر حوکمەکە دەرچوو وە پەیوەندی هەبوو بە (النفاذ المعجل).

تێبینی/ ئەگەر حوکمەکە گەیشتە پلەی بەتات ئەوە ناکرێ جارێکی تر ئەو کێشەیە بەرز بکرێتەوە بۆ بەرامبەر دادگا.

دووەم/ الاحکام الحضوریة والاحکام الغیابیة:

حوکمی حضوری ئەو حوکمەیە کە لە دادگاییەکی حضوري دەردەچێ، وە دادگایی حضوري (المحاکمة الحضوریة): ئەو دادگایەیە کە هەموو لایەنەکانی دەعوا ئامادە دەبن لە مرافعە، وە ئەگەر یەکێ لە لایەنەکان تەنها بۆ جارێك ئامادە بوو پاشان ئامادە نەبوو ئەوە هەر دادگایەکە بە حچوری هەژمار دەکرێت.

بەڵام حوکمی غیابی ئەو حوکمەیەیە کە لە دادگاییەکی غیابی دەردەچێ، وە دادگای غیابی (المحاکمه الغیابیه): ئەو دادگایەیە کە یەکێ لە لایەنەکانی دەعوا ئامادەی هیچ دانشتنێکی مرافعە نەبووە لە سەرەتاوە هەتا وەکو دەرچوونی حوکم لەگەڵ ئەوەی کە تبلیغێکی دروست کراوە.

سێ یەم/ الاحکام الصادرة بدرجة اولی والاحکام الصادرة بدرجة اخیرة:

الاحکام الصادرة بدرجة اخیرة (ئەو ئەحکامانەی کە بە پلەی کۆتایی دەردەچن): ئەو ئەحکامەیە کە دەکرێ تانەی لێ بگیرێ تەنها بە یەك رێگا ئەویش رێگای تەمییزە جا یان لە لای: دادگای ئیستئناف بە سیفەتی تەمیزی ئەگەر حوکمەکە لە دادگای بەرایی دەرچوو لەو داوایانەی کە بەهاکەیان لە (١٠٠٠) دینار کەمترە، یان لە لای دادگای تەمییز ئەگەر حوکمەکە لە دادگاکانی باری کەسی و موادی کەسی و کار دەرچوو بوو.

بەڵام الاحکام الصادرة بدرجة اولی ئەو ئەحکامانەیە کە دەکرێ تانەیان لێ بگیرێ بە هەردوو رێگای ئیستئناف و تەمییز.

چوارەم/ الاحکام المقررة والمنشئة:

١- الحکم المقرر (الکاشف): ئەو حوکمەیە کە حاڵەتێك دوپات دەکاتەوە کە بوونی هەبووە پێش وەقت، بێ ئەوەی یەکێ لە لایەنەکان ناچار بکات بەکارێکی دیاریکراو. بۆیە ئەم حوکمە تەنها پەیوەندیەکی یاسایی دیاریکراو دوپات دەکاتەوە و شك و گومان لە دەوری ناهێڵێ، بۆ نموونە دوپات کردنەوەی پەیوەندی خێزانی یان دروستی گرێبەست .... هتد.

٢- الحکم المنشئ: ئەو حوکمەیە کە مەرکەزێکی یاسایی یاخود مافێکی تازە دروست دەکات یان دەیگۆرێت یان کۆتایی پێ دێنێ، بۆ نموونە ئەو حوکمەی کە دەردەچێ بە افلاس کردنی بازرگانێ.

**اجراءات اصدار الحكم: یەکەم/ ختام المرافعة:**

**ماددەی (١٥٦) ی یاسای مرافعات ئاماژە بەوە دەکات کە ئەگەر داواکە ئامادەبوو بۆ دەرچوونی حوکم ئەوە دادگا بریار دەدات بە کۆتایی هاتنی دانیشتنەکانی دادگا، پاشان حوکم دەردەکات لە هەمان رۆژ یان لە رۆژێکی تر کە نابێ لە (١٥) رۆژ زیاتر بێ لە مێژووی زانینی لایەنەکان بە کۆتایی هاتنی مرافعە، وە ئەمەش لەو کاتە دەبێ کە لایەنەکان و شاهێدەکان قسەکانیان کۆتایی دێ وهەموو بەڵگەکانیان پێشکەش دەکەن ودادگا لە لایەنەکان دەپرسێ ئایە قسەی تریان ماوە؟ ئەگەر وەڵامیان دایەوە بە نەرێ (نەفی) ئەوە دادگا بریار دەدات بە کۆتایی هاتنی مرافعە بە مەرجێك داوالێکراو کۆتا لایەن بێ کە قسە بکات.**

**وە نابێ بۆ دادگا گوێ بگرێ بۆ قسەکانی یەکێ لە لایەنەکان إلاّ بە ئامادەبوونی لایەنەکانی تر، وئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دەکرێ دادگا دەرگای مرافعە بکاتەوە سەر لەنوێ ئەگەر پێویست بوو، وە دەبێ ئەو هۆکارانە بنوسێت کە وای لە دادگا کرد مرافعە بکاتەوە، وپاش پڕکردنەوەی ئەو کەم وکوریە دادگا بریار دەدات بە داخستنی مرافعە بۆ جاری دووەم.**

**دووەم/ المداولة وتنظیم الحکم والنطق بە:**

**پاش ئەوەی دادگا بریار دەدات بە کۆتایی هاتنی مرافعە خۆی ترخان دەکات بۆ پرۆسەی دەرچواندنی حوکم. ودبێ دادوەر مداوەلە ومشاوەر وپرس ورا بکات لەگەڵ خودی خۆی ئەگەر دادگاکە لەیەك دادوەر پێك هاتبوو، ولەگەڵ دادوەرانی تر ئەندامانی دادگا ئەگەر دادگاکە لە چەند دادوەرێك پێك هاتبوو، وئەم پرس ورایە دەکرێ سەبارەت بە ناوەرۆکی حوکمەکە وهۆکارەکانی پاش داخستنی دانیشتنەکانی دادگا وپێش ڕاگەیاندنی حوکمەکە. وپێویستە بە شێوەیەکی نهێنی ئەنجام بدرێت هەتاوەکو دادگا سەربەخۆ بێ وئەندامان ئازادانە ڕای خۆیان بدەن.**

**وئەگەر دادگا پێك هاتبوو لە چەند دادوەرێك ئەوا مداوەلە وپرس ورا دەکرێت لە شێوەی گۆرینەوەی بیر وڕای دادوەران وهەڵبژاردنی ڕای ڕاست لە کاتی جیاوازی، ودادگا گوێ دەگرێ یەکەم جار بۆ ئەندامی پلە نزم دواتر ئەندامی کۆنتر دواتر سەرۆکی دادگا، ولە کاتی جیاوازی ڕا وبۆچوونی دادوەران پەنا دەبرێتە بەر زۆرینەی ڕەهای ژمارەی ئەندامانی دەستەی دادوەری، وئەگەر زۆرینە نەهاتە دی (واتا چەند ڕایەك هەبوو) ئەوە پێویستە لەسەر ئەندامی پلە نزم بچێتە پاڵ یەکێ لە ڕاوبۆچونەکان بۆ دروست بوونی زۆرینە.**

**ودوای کۆتای هاتنی مداوەلە (چ لە حاڵەتی تاك دادوەری یاخود فرە دادوەری) ئەوە دادوەر هەڵدەستێ بە رێکخستنی حوکمودەرچواندنی پاش نوسینەوەی لە مەحزەری دانیشتنەکان پاشان واژووی لەسەر دەکات پێش ڕاگەیاندن وئاشکراکردنی، وئەگەر دادگاکە لە چەند دادوەرێك پێك هاتبوو ئەوە سەرۆکی دەستە ئەندامەکان واژووی لەسەر دەکەن پێش ئاشکراکردنی، وپێویستە لەسەر ئەو ئەندامەی کە ڕایەکی جیاوازی هەیە ڕایەکە وهۆکارەکەی بنوسێتەوە، وئەم ڕا جیاوازە ناخوێندرێتەوە بەڵکو دەپارێزرێت لە ئیزبارەی داواکە.**

**پاشان پێویستە لەسەر دادگا حوکمەکە دەرچوێنێ وئاشکرای کات بە ناوی گەل، وناوەرۆکی حوکمەکە بخوێنێتەوە لەگەڵ هۆکارەکەی لە دانیشتنێکی دیار وئاشکرا وبە ئامادەبوونی لایەنەکان و ئەندامانی دادگا.**

سێ یەم/ تسبیب الاحکام:

ماددەی (١٥٩) لە یاسای مرافعات ئاماژە بەوە دەکات کە:

١- پێویستە حوکم ئەو هۆکارانە لەخۆ بگرێت کە لەسەری بنیات نراوە، ودەبێ لەو هۆکارانە بێ کە یاسا ئاماژەی پێ کردووە.

٢- پێویستە لەسەر دادگا لە حوکمەکەیدا باسی ئەو لایەنانە بکات کە وای لە دادگا کرد قبولی یان رەددی داواکاریەکان ودفوع بکات کە لە لایەنەکان پێشکەش کرابوو، هەروەها باسی ئەو ماددە یاسایانە بکات کە اعتماد وپشتی پێ بەستبوو.

بۆیە پێویستە دادگا لە حوکمەکەید ئاماژە بە هەموو ئەو هۆکارە یاسایی و واقعیانە بکات کە لەسەری بنیات نراوە.

پ/ جیاوازی چی یە لە نێوان هۆکاری یاسایی و هۆکاری واقعی؟

وە/ کەم وکوڕی لە هۆکاری واقعی حوکم دەبێتە هۆی باطل یان فسخ یان نقچ بوونی حوکمەکە. بەڵام کەم وکوڕی لە دیریکردنی هۆکاری یاسایی وا لە حوکمەکە ناکات ئەگەر هاتوو ئەو دەرەنجامەی کە دادوەر پێی گەیشتبوو ڕاست ودروست بوو.

چوارەم/ آثار الاحکام:

١- خروج النزاع من ولایة القاضي:

بە خوێندنەوەی حوکم ئەو کێشەیەی کە داوای لەسەر بەرزکرابۆوە دەردەچێ لە دەسەڵاتی دادگا، بۆیە دادگا بۆی نی یە دەستکاری حوکمەکە بکات وبیگۆڕێ تەنها لە دوای گرتنە بەری یەکێ لە ڕێگاکانی تانە گرتن.

٢- حسم النزاع بشأن الحق موضوع الدعوی:

حوکم ئامرازێکە دادوەر لە ڕێگەیەوە ئەوە ئاشکرا دەکات کە مافەکە بۆ کێ دەگەرێتەوە، بۆیە حاڵەتی نا ڕوونی ولێڵی لەسەر مافە لادەدات. وئەسلیش لە ئەحکام ئاشکراکەری مافەکانە نەك دروست کەری.

٣- حجیة الامر المقضي فیە:

ئەمەش قەرینەیەکی یاساییە کە قبوڵی سەلماندنی پێچەوانەی نی یە، وئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە حوکمەکە بە دروستی دەرچووە لە ڕووی شکلی و موضوعي. بۆیە حوکمەکە دەبێتە حوجە و بەڵگەیەك لە سەر ئەو کێشەیەی کە حوکمی لەسەر داوە، وئەم حوجییە دەمێنێتەوە تەنها ئەگەر حوکمەکە باطل یان فسخ یان نقض یا گۆڕانکاری لەسەری کرا.

٤- مصاریف الدعوی:

بەرزکردنەوەی داوا پێویستی بە رسومات ومصاریف هەیە، وئەم رسوماتە پێشەکی داواکار دەیدات بەڵام پاش دەرچوونی حوکم ئەوە دۆڕاو (حوکوم لەسەردراو) دەیدات، چ داواکار بێ یا داوالێکراو، ولەو مصاریفانەش کرێی خبیر وپارێزەر وکشف وخەرجی گواستنەوەی شاهێد وکرێی ترجمە و ... هتد.

**تصحيح الاحكام وتفسيرها**

**راستكردنەوەی حوكم وراڤەكردنی**

**لەوانەیە لە دوای دەرچوونی حوكم هەندێ هەڵەی بەرجەستەیی وژمێریاری تێدابێ، وە ئەم هەڵەیە كاریگەری نی یە لەسەر راستی ودروستی حوكمەكە، بەڵام پێویستە ڕاست بكرێتەوە لەلایەن هەمان ئەو دادگایەی كە دەریكردوە لەسەر داوای یەكێ لەلایەنەكانی داوا بە عەریزەیەكی نوسراو، وە ئەگەر داوای لێكرا بە راستكردنەوەی هەڵەی حوكوم ئەوە دادگا لایەنەكانی داوا بانگ دەكات و گوێ لە وتەكانیان دەگرێت و پاشان بریارەكەی دەردەكات بە راستكردنەوەی ئەو هەڵەیە، وە بڕیاری راستكردنەوەكە دەنوسرێتەوە لە پەراوێزی حوكمەكە وە تۆماریش دەكرێت لە دادگا پاشان لایەنەكانی لێ ئاگادار دەكرێتەوە.**

**وە مەبەست لە هەڵەی ژمێریاری ئەوەیە كە روودەدات لە ئەنجامی كردارەكانی كۆ و دەرهێنان و جارانكردن. وە هەڵەی بەرجەستەیی (مادی) بریتیە لە هەڵەی نوسین و تایپ، بۆ نموونە ناوی (أحمد) بنوسێت لەجیاتی (حمد) یان (حسن) بنوسێت لەجیاتی (حسین)، هەر بۆیە ئەم هەڵانە كاریگەری نابێت لەسەر خودی ڕاستی حوكمەكە.**

**وە سەبارەت بە راڤەكردنی حوكوم: ئەگەر ناوەرۆكی حوكمەكە ناروون و نادیار بوو، هەمووی یان بەشێكی، كە ئەمەش وای دەكرد فەرمانگەی جێ بەجێ كردن (مدیریة التنفیذ) نەتوانێ ئەو حوكمە جێ بەجێ بكات وە نەزانێ مەبەستی دادوەر چی یە لەو حوكمە، ئەوە لەم حاڵـەتەدا جێ بەجێكاری دادوەری (منفذ العدل) دەتوانێ داوای روون كردنەوە حوكمەكە بكات لەو دادگایەی كە حوكمەكەی دەركردوە، وە دادوەر بریاری روونكردنەوە دەردەكات و دەینێری بۆ جێ بەجێكاری دادوەری. بەڵام ئەو بەشەی كە روونە لە حوكمەكە ئەوە دەبێ جێ بەجێ بكرێت.**

**بۆیە راڤەكردنی حوكوم پێویستی بەم مەرجانە هەیە:**

**١- دەبێ ناوەرۆكی حوكمەكە ناروون و نادیار بێت، بۆ نموونە دادگا بڕیاری داوە بە كرێی پارێزەر بەبێ دیاریكردنی مقدار و بەهاكەی.**

**٢- دەبێ جێ بەجێكاری دادوەری (منفذ العدل) داوای روون كردنەوە حوكمەكە بكات لەو ناروونی یە بە داواكاریەكی فەرمی وە دەینێرێ بۆ دادگا، وە پاش لێكۆڵینەوەی دادگا لە حوكمەكەی بڕیاری راڤە دەردەكات و دەینێرێ بۆ جێ بەجێكاری دادوەری (منفذ العدل).**

**٣- دەبێ ئەو حوكمەی كە داوای راڤەكردنی دەكرێت پلەی بنبڕ و باتی وەرگرتبێت، چونكە ئەگەر وانەبێ ئەوە دەكرێ تانەی لێ بگیرێ بە رێگاكانی تانەگرتن.**

**٤- پێویستە بڕیاری راڤەكردن دەربچێت لەلایەن هەمان ئەو دادگایەی كە حوكمەكی دەركردوە.**

**الحكم المشمول بالنفاذ المعجل**

**ئەو حوكمەیە كە دەكرێ جێ بەجێ بكرێ پێش ئەوەی پلەی بەتات وەربگرێ. وحوكمیش پلەی بەتات وەردەگرێ لە دوو حاڵەت: بە كۆتایی هاتنی ماوەی تانەگرتن، وبە تەصدیق ودوپاتكردنەوەی دادگا بۆ حوكمەكە.**

**وئەو ئەحكامانەی كە نەفاذي معجل دەیانگرێتەوە دەكرێن بە دوو بەش:**

**يەكەم: الاحكام المشمولة بالنفاذ المعجل بقوة القانون، ئەو ئەحكامانەی كە نەفاذي معجل دەیانگرێتەوە بە هێزی یاسا:**

**ماددەی (١٦٥) لە یاسای مرافعات ئاماژە بەوە دەكات كە نەفاذي معجل واجبە بە هێزی یاسا لە هەموو حوكمێكی بژێوی هەروەها لەو قرارانەی كە پەیوەندارن بە حاڵەتەكانی مستعجل وپلە (الاوامر الصادرة على العرائض)، ودادگا دەتوانێ ڕاستەوخۆ جێ بەجێی بڕیارەكانی بكات، ودەشكرێ جێ بەجێ كردنەكەی بدرێتە دەست دائرەي تنفیذ.**

**دووەم: الاحكام المشمولة بالنفاذ المعجل بحكم قضائي: ئەو ئەحكامانەی كە نەفاذی معجل دەیانگرێتەوە بە حوكمی دادگا:وئەمەش دەكرێت بە دوو بەشەوە:**

**١- حالە الوجوب: واجب وئەركە لەسەر دادگا بڕیار بدات بەوەی كە حوكمەكە نەفاذي معجل دەیگرێتەوە، ئەمەش لەسەر داوای حوكوم بۆ دراو ئەگەر حوكمەكە بونیات نرابوو لەسەر سەنەد وبەڵگەیەكی فەرمی یان لەسەر دان پێنانی ئەو كەسەی كە مافەكەی زەوت كردووە یان لەسەر نكۆڵی كردن لە سوێند خواردن. ئەوا لە هەموو ئەم حاڵەتانە هیچ حیكمەت وپێویستیەك ناكات كە حوكمەكە جێ بەجێ نەكرێ هەتا دوای تەواو بوونی ماوەی تانەگرتن لێی.**

**٢- حالە الجواز: ماددەی (٢/١٦٤) لە یاسای مرافعات ئاماژە بەوە دەكات كە بۆ دادگا هەیە بڕیار بدات بەوەی كە حوكمێك نەفاذي معجل بیگرێتەوە بە مەرجی پێشكەش كردنی كەفالە ئەگەر مافەكە وا پێویستی دەكرد كە زوو جێ بەجێ بكرێت بۆ نموونە لەو شتانە بوو كە زوو تێك دەچوو.**

**س/ ماهي الآثار التي تترتب على شمول الحكم بالنفاذ المعجل؟**

**١- وەكو بنەمای گشتی ئەگە تانەگیرا لە حوكم ئەوا جێ بەجێ كردنی ئەو حوكمەی كە نەفاذي معجل دەیگرێتەوە تاخیری ناكات.**

**٢- ئەگەر ئەو حوكمەی كە نەفاذي معجل دەیگرێتەوە جێ بەجێ كرا پاشان بڕیار درا بە ابطال یان فسخ یان نقض كردنی ئەو حوكمە ئەوا پێویستە لەسەر دائرەی تنفیذ هەردوو لایەن بگەڕێنێتەوە بۆ حاڵەتی پێش جێ بەجێ كردنی حوكمەكە ئەگەر ئەمە لە توانادابوو، یاخود بڕیار دەدات بە قەرەبوو كردنەوەی لایەنی بەرامبەر ئەگەر لە توانادا نەبوو.**

**طرق الطعن في الأحكام والقرارات**

**الاحكام العامة للطعن في الاحكام والقرارات**

**پێناسەی ڕێگاكانی تانە گرتن:**

**بریتیە لەو ئامرازە یاساییانەی كە یاسادانەر دایناوە بۆ ئەوەی حوكم لەسەردراو (محكوم علیە) بتوانێت داوای دووبارە تەمەشاكردنی ئەو حوكمەی كە لە دژی دەرچووە بكات یاخود ئەو حوكمەی كە هەموو داواكارییەكانی نەهێناوەتە دی، بە ئامانجی إبطال كردنی ئەو حوكمە یان فسخ كردنی یان نقض كردنی.**

وە ماددەی (١٦٨) لە یاسای مرافعاتی عیراقی ئاماژە بە ڕێگاکانی تانەگرتنی کردووە کە ئەمانەن:
الاعتراض على الحكم الغيابي.
الاستئناف
اعادة المحاكمة.
التمييز.
تصحيح القرار التمييزي.
اعتراض الغير.

پ / جیاوازی چیە لە نێوان ڕێگاکانی تانە گرتنی ئاسایی و نائاسایی؟
١- ڕێگاکانی تانەگرتنی ئاسایی دووە کە ئەویش: (الاعتراچ على الحكم الغيابى، الاستئناف )، بەڵام ڕێگاکانی تانەگرتنی نائاسایی چوارن کە ئەوانیش: (اعادە المحاكمە، التمييز، تصحيح القرار التمييزى، اعتراچ الغير)ە.
٢- کەسی حوکم لەسەردراو دەتوانێ ڕێگاکانی تانەگرتنی ئاسایی بگرێتە بەر ئەگەر بەو حوکمەی کە لەسەری دراوە ڕازی نەبوو پێی بێ ئەوەی ببەسترێتەوە بە بوونی هۆکارێکی دیاریکراو، بەڵام کەسی حوکم لەسەردراو ناتوانێ ڕێگاکانی تانە گرتنی نائاسایی بگرێتەبەر ئیلا ئەگەر هاتوو چەند هۆکارێکی دیاریکراوی هەبوو کە یاسا دیاری کردووە.
٣- ئەو ئاسەوارەی دێتەکایەوە لە گرتنەبەری ڕێگاکانی تانەگرتنی ئاسایی ئەوەیە کە کێشەکە سەر لە نوێ تەماشادەکرێتەوە لە ڕووی یاسا و واقیعەوە، بەڵام گرتنەبەری ڕێگاکانی تانەگرتنی نائاسایی تەنها ئەوەی لێ دەکەوێتەوە کە تەمەشای عیوبی یاسایی حوکمەکە دەکرێت کە حوکم لەسەردراو ئیدعای دەکات.
٣- ڕێگاکانی تانەگرتنی ئاسایی دەبێتە هۆی ڕاگرتنی جێبەجێ کردنی حوکم وەکو بنەمایەکی گشتی، بەڵام ڕێگاکانی تانەگرتنی نائاسایی نابێتە هۆی ڕاگرتنی جێبەجێ کردنی حوکم وەکو بنەمای گشتی.

پ/ ئەو حوکم و قراراتانەی کە تانەی لێ دەگیرێت چین ؟
١- وەکو ڕێسایەکی گشتی حوکم تانەی لێ دەگیرێ، بەڵام ئەو قرارانەی کە ئەنجام دەدرێت لە کاتی تەماشاکردنی داوایەکە ئەوا تانەی لێ دەگیرێ لەگەڵ حوکمی داوایەکە نەوەك بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ.
٢- القرارات المستقلە: بەڵام ئەو قرارانەی کە دەکرێ بە شێوەیەکی سەربەخۆ تانەی لێ بگیرێت ئەوەیە کە لە مادەی (٢١٦) لە یاسای مرافعاتی عیراقی باس کراوە.

إجراءات الطعن ( ڕێ وشوێنی تانەگرتن ):
١- تانەگرتن بە عەریزە دەبێ، وپێویستە هۆکارەکانی تانەگرتن لەخۆ بگرێ هەروەها ئەو شوێنەی کە هەڵی دەبژێرێ بۆ مەبەستی تبلیغ وئەو حوکمەی کە تانەی لێ دەگرێ وئەو دادگایەی کە دەری کردووە.
٢- پێدانی ڕەسمی تانەگرتنەکە.
٣- دەبێ ئەو کەسەی تانە دەگرێ چەند وێنەیەك وەکو هاوپێچ لەگەڵ عەریزەکەی پێشکەش بکات بۆ ئەوەی تبلیغی لایەنەکان بکرێتەوە بەپێی یاسا، وە نابێ دوو تانە لە یەك عەریزەدا بێ.

**پ/ کێ مافی تانە گرتنی هەیە ؟**

**وەڵام/ ئەو لایەنەی کە دۆڕاوە لە داوایەکە مافی تانەگرتنی هەیە چونکە بەرژەوەندی هەیە لەم تانەگرتنە، بە مەرجێك نابێ خۆی تنازولی کردبێ لە مافەکەی لەو داوایەکە.**

**پ/ تانەگرتن ئاراستەی کێ دەکرێ؟**

**وەڵام/ تانەگرتن ئاراستەی کەسی حوکم بۆدراو (المحکوم لە ) دەکرێ، واتە ئەو کەسەی کە داوایەکەی بردۆتەوە جا ئەو کەسە داواکارە یان داوالێکراوە، یان کەسی سێیەمە لە داوایەکە.**

**پ/ ئەو کەسەی سوود لە تانە گرتنەکە وەردەگرێ کێ یە ئەگەر چەند حوکم دراوێك هەبوو ؟**

**وەڵام/ وەکو ئەصل تەنها ئەو لایەنە سوود وەردەگرێ کە تانەی بەرزکردۆتەوە، بەڵام یاسا چەند إستپنایەکی دیاریکردووە لەم ئەصلە کە ئەمانەن:**

**١- ئەو کەسەی کە بەرژەوەندیەکی پەیوەستی هەیە بە مافەکانی ئەو کەسەی کە گۆڕانکاری لە حوکمەکە کرا لە بۆ بەرژەوەندی ئەوا کەسی یەکەمیش سوود لەم گۆڕانکاریە وەردەگرێ.**

**٢- ئەو کەسە سوود لە گۆڕانکاری حوکمەکە وەردەگرێ ئەگەر داواکار یان داوالێکراو بوو لەگەڵ ئەو کەسەی کە تانەی بەرزکردۆتەوە وە حوکمەکە گۆڕا لە بەرژەوەندی، وە کێشەکە پەیوەست بوو بە شتێکەوە کە ناکرێ پارچە پارچە بکرێ.**

**٣- ئەگەر گۆڕانکاری لە حوکمەکە کرا لەسەر چەند هۆیەکی تایبەت بە ئەو کەسەی کە تانەی بەرزکردۆتەوە، ئەوە کەسی تر بۆی نیە سوود لەو گۆانکاریە وەربگرێ.**

**مدة الطعن (ماوەی تانەگرتن ):**

**مافی کەسەکان لە بەرزکردنەوەی تانەگرتن بەستراوەتەوە بە سقفێکی زەمەنی دیاریکراو کە نابێ لێی تێپەر بکات ئەگینا مافی تانەگرتنی دەفەوتێ، وەئەم ماوەیەش دەگۆڕێ لە رێگایەکی تانەگرتن بۆ رێگایەکی تر، بەڵام لە هەندێ حاڵەتدا ئەم ماوەیە ڕادەوەستێ ئەگەر ئەم هۆکارانەی لای خوارەوە هاتە دی: ـ**

**مردنی حوکم لەسەردراو (المحکوم علیە).**

**ئەگەر حوکم لەسەردراو ئەهلیەتی لە دەستدا و نەیما.**

**ئەگەر ئەو کەسەی بەژداری داوایەکەی دەکرد لە جیاتی حوکم لەسەردراو سیفەتی خصومەی لێ سەندرایەوە لە داوایەکە.**

**یەکەم: الاعتراض علی الحکم الغیابي (نارەزایی لەسەر حوکمی غیابی )**

**حوکمی غیابی: ئەو حوکمەیە کە دەردەچێت لە دژی یەکێك لە لایەنەکانی داوا ئەگەر هاتوو غائیب و ئامادەنەبوو لە دادگا لە یەکەم دانیشتنەکانی دادگا هەتاوەکو دەرچوونی حوکم لەگەڵ ئەوەی تەبلیغێکی دروست کرا بوو.**

**پ/ حیکمەتی ئەم تانەگرتنە چییە ؟**

**وەڵام/ حیکمەتەکەی ئەوەیە هەتاوەکو ئەو لایەنەی کە ئامادەی دانیشتنەکانی دادگا بووە ئیستغلالی ئامادەنەبوونی لایەنی بەرامبەر نەکات کە هیچ دیفاع و داکۆکیەك لە خۆی ناکات، چونکە ڕێگەی (الاعتراض علی الحکم الغیابی ) ئامانجی ئەوەیە کە دووبارە تەماشای داواکە بکرێتەوە وە حوکمێکی نوێی لەسەر دەربچێ، لەبەر ئەوەی ئەو حوکمە بە غیابی دەرچووە بێ ئەوەی گوێ بدرێتە دیفاعی لایەنی بەرامبەر، وە ڕێسا ئەوە دەخوازێ کە نابێ حوکم لەسەر کەسێك بدرێت بێ ئەوەی گوێ بدرێتە دیفاعەکەی.**

**پ/ کێ مافی تانەگرتنی هەیە بەم ڕێگایە؟ (من له حق الاعتراض علی الحکم الغیابي )؟**

**ئەو لایەنەی کە حوکم لەسەردراوە بە غیابی ماف ئەوەی هەیە تانە بگرێ بە ڕێگەی ناڕەزایی لەسەر حوکمی غیابی، جا ئەم لایەنە داواکارە یان داوالێکراوە یان کەسی سێ یەمە هاتۆتە ناو داواکەوە، بەڵام پێویستە دوو مەرج بێتە دی لەم حاڵەتەدا:**

**١- نابێ ماف تانەگرتنی بەم ڕێگەیە سقوط کرابێ، وەکو تێپەر بوونی کاتی تانەگرتن.**

**٢- نابێ پێشتر تانەی گرتبێ لەم حوکمە غیابیە بە ڕێگایەکی تر لە ڕێگاکانی تانەگرتن.**

**پ/ ئەگەر چەند حوکم دراوێك هەبوون (فرە حوکم دراو) ویەکێکیان اعتراضي گرت وئەوانی تر نەیان گرت چ ئاسەوارێکی یاسایی دێتە کایەوە؟**

**وەڵام: وەکو ئەصل تەنها ئەو کەسەی کە اعتراضي گرتووە سوود لەو اعتراضة دەکات، بەڵام بە شێوەیەکی استسنائی ئەگەر لەو کەسانە نەبوو کە ماددەی (١٧٦) لە یاسای مرافعات باسیانی کردووە ئەوە ئەوانیش سوود لەو اعترازە دەگرن.**

**پ/ ئەگەر هەندێ لە حوکم دراوەکان تانەیان گرت بە ڕێگەی اعتراض علی الحکم الغیابی وهەندێکی تر لە حوکم دراوەکان تانەیان بە ڕێگەی ئیستئناف یان تەمییز چ ئاسەوارێکی یاسایی دێتە کایەوە؟**

**وەڵام: لەم حاڵەتەدا نابێ تەمەشای تانەگرتن بە ڕێگای ئیستئناف وتەمییز بکرێت هەتاوەکو تانەگرتن بە ڕێگای اعتراض علی الحکم الغیابی یەکلایی دەبێتەوە، واتا یەکەمجار تەمەشای اعتراض علی الحکم الغیابی دەکرێ پاشان ڕێگاکانی تر.**

**پ/ ئەو ئەحکامانە چین کە یاسا ڕێگەی داوە تانەی لێ بگیرێ بە ڕێگەی اعتراض علی الحکم الغیابی؟**

**وەڵام: یاسا ڕێگەی داوە تانە بگیرێت بەم ڕێگەیە لە ئەحکامەکانی دادگای بەرایی وباری کەسایەتی، بەڵام ئەو حوکمانەی کە لە دادگای ئیستئناف دەردەچێت ناکرێ تانەی لێ بگیرێ بەم ڕێگەیە.**

**پ/ ماوەی تانەگرتن بە ڕێگەی اعتراض علی الحکم الغیابی چەندە؟**

**وەڵام: ماوەی تانەگرتن بەم ڕێگایە (١٠) ڕۆژە، دەست پێ دەکات لە ڕۆژی دواتری تەبلیغ کردنی حوکمەکە، وئەم**

ماوەیە لە نیزامی عامدایە بۆیە پێویستە لەسەر دادگا رەددی ئەم تانەیە بکات ئەگەر لە دوای (١٠) رۆژەکە بەرز کرایەوە.

پ/ ئیجرائاتی ریگەی الاعتراض علی الحکم الغیابی چییە؟

وەڵام: ناڕەزایی لەسەر حوکمی غیابی دەعوایە بۆیە پێویستە بە عەریزە پێشکەش بکرێت وئاماژە بە هۆکارەکانی اعتراز بکرێت ودەدرێتە هەمان ئەو دادگایەی کە حوکمە اعتراز لیٚ گیراوەکەی دەرکردووە ڕاستەوخۆ، وپێویستە رەسمی اعترازیش بدات.

نظر الدعوی الاعتراضیة، تەمەشای داوای نارەزایی:

دوای ئەوەی دادگا کاتی دانیشتنەکانی مرافعە دیاری دەکات ولایەنەکان (المعترض والمعترض علیه) ئاگادار دەکاتەوە، ئەوا لە رۆژی دادگایەکە سیٚ حاڵەتمان دەبیٚ:

١- حضور الطرفان:

ئەگەر هەردوو لایەن ئامادەبوون ئەوا دادگا هەڵدەستیٚ بە تەدقیق کردنی اعترازەکە لە ڕووی شکلەوە وئایە لە کاتی خۆی بەرزکراوەتەوە وهۆکارەکانی اعترازی لەخۆ گرتووە، بۆیە ئەگەر ئەم دوو مەرجەی تێدا نەبوو ئەوا دادگا بریار دەدات بە رەد کردنەوەی اعترازەکە لە ڕووی شکلەوە، بەڵام ئەگەر ئەم دوو مەرجەی تێدابوو ئەوا دادگا وەری دەگریٚ و تەمەشای بابەتی اعترازەکە دەکات وگویٚ لە لایەنەکان دەگریٚ پاشان بریار دەردەکات یان بە پشت راستکردنەوەی حوکمی غیابی یان بە ابطال کردنی یان تعدیل کردنی.

٢- غیاب الطرفان:

ئەگەر هەردوو لایەن ئامادەنەبوون لە رۆژی دیاریکراوی مرافعە ئەوا دادگا ڕادەوەستێت هەتاوەکو (١٠) رۆژ، وئەگەر هەر ئامادەنەبوون لەدوای تێپەر بوونی ئەم ماوەیە ئەوا دەعوای اعتراز سقوط دەکات وناکریٚ جارێکی تر بەرز بکرێتەوە.

٣- حضور طرف وغیاب طرف آخر:

ئەگەر یەکیٚ لە لایەنەکان ئامادەبوو وئەوەی تریان ئامادە نەبوو لەگەڵ ئەوەی تەبلیغیش کراوە، ئەوا دادگا بەردەوام دەبێت لە تەمەشاکردنی دەعوای اعتراز وحوکم دەردەکات یان بە تەئید وپشت راستکردنی حوکمە غیابیەکە یان ابطال یان تعدیل کردنی. ولەم حاڵەتەدا ئەو حوکمەی کە دەردەچیٚ بە حوکمێکی حضوري دادەنریٚ بە نیسبەت هەردوو لایەن ئەوەی کە ئامادەبوو و ئەوەی کە ئامادە نەبوو، بۆیە ناکریٚ جارێکی تر تانەی لیٚ بگیریٚ بە ریٚگەی اعتراض علی الحکم الغیابی.

آثار الاعتراض علی الحکم الغیابي:

چەند ئاسەوارێکی یاسایی دێتە کایەوە لە گرتنەبەری ئەم ڕێگایە کە ئەمانەن:

١- گرتنەبەری ئەم ڕێگایە دەبێتە هۆی ڕاگرتن وتەئخیر کردنی جێ بەجێ کردنی حوکم، چونکە ڕێگایەکە لە ڕێگاکانی تانەگرتنی ئاسایی.

٢- اعادة النظر في النزاع: گرتنەبەری ئەم ڕێگایە وا دەکات دوو بارە تەمەشای کێشەکە بکرێتەوە لە سەرەتاوە پێش دەرچوونی حوکم لەسەری.

٣- لا يجوز الطعن في الحكم الصادر بنتيجة الاعتراض بطريق الاعتراض على الحكم الغيابي: واتا ناکرێ جارێکی تر تانە بگیرێ لەو حوکمەی کە دەردەچێ لە دەرەنجامی اعتراز گرتنەکە بە رێگەی اعتراض على الحكم الغيابى، چونکە ئەم رێگەیە رێگەی پێ دراوە تەنها بۆ یەکجار وحوکمەکە بە حضوري دادەنرێ بە نیسبەت هەردوو لایەن، بەلاّم دەکرێ تانەی لێ بگیرێ بە رێگاکانی تر وەکو ئیستئناف و تەمییز واعاده المحاكمه وتصحيح القرار التمييزى.

دووەم: الاستئناف

پێناسە:

استئناف - تێهەڵچوونەوە- ڕێگایەکە لە ڕێگاکانی تانەگرتنی ئاسایی، ئامانجی دووبارە تەماشاکردنی حوکمێکە لە ئەحکامەکانی دادگای بەرایی لە ڕووی واقع ویاساوە هەتا دەگاتە ابطال یان فسخ کردنی ئەو حوکمە و دەرچواندنی حوکمێکی تازە یان تعدیل کردنی ئەو حوکمە.

پ/ ئەو حوکمانەی کە دەکرێ تانەی لێ بگیرێ بە ڕێگای استئناف چین؟

١- ئەو حوکمانەی کە لە دادگای بەرایی دەردەچێت بە پلەی یەکەم لەو داوا مەدەنیانەی کە بەهاکەیان لە هەزار دینار زیاترە، جیاوازی نی یە دەعواکە هی قەرزە یان منقوله یان عقارە.

٢- ئەو ئەحکامانەی کە دەردەچن وپەیوەندیان هەیە بە بابەتی افلاس جا هەر چەندێ بێت بەهاکەی.

٣- ئەو ئەحکامانەی کە دەردەچن وپەیوەندیان هەیە بە بابەتی تصفیەی کۆمپانیاکان جا بەهاکەی هەر چەند بێ.

پ/ موددەی تانە گرتن بە ڕێگای استئناف چەندە؟

ماوەی تانەگرتن بەم ڕێگایە (١٥) ڕۆژە دەست پێ دەکات لە ڕۆژی دواتر لە تەبلیغ کردنی حوکمەکە بەلایەنەکان.

إجراءات الطعن بطريق الإستئناف:

تانە گرتن بە ڕێگەی استئناف بە عەریزە بەرزەکر ێتەوە بۆ ئەو دادگا استئنافی یەی کە دادگاکە پاشکۆیەتی یاخود بەرزەکرێتەوە بۆ هەمان ئەو دادگایەی کە حوکمەکەی دەرکردوە، وە لە هەر دوو حاڵەتدا پێویستە کەسی تانەگر بەم رێگەیە (مستأنف) هەمان ئەو مەرجانەی تێدابێ کە پێویستە بۆ قبول کردنی دەعوا لە اهلیه وصفه ومصلحه، هەروەها پێویستە سەرەڕای ئەو بەیاناتانەی کە دەبێ لە عەریزەکەدابێ وەکو دەعوا ئەوا پێویستە ئاماژە بەو شوێنە بکات کە مستأنف هەڵی دەبژێرێ بۆ مەبەستی تەبلیغ کردن وپوختەیەك لە حوکمەکەو ئەو دادگایەی کە دەری کردوە ومێژوی دەرچونی وهۆکارەکانی استئناف وداواکاریەکانی مستأنف. ودادگای استئناف هەڵدەستێ بە تۆمارکردنی

ئەم عەریزەیە ورەسمی لێ وەردەگرێت ورۆژی تەماشاکردنی دیاری دەکات وتبلیغی لایەنەکان دەکاتەوە لەگەڵ تبلیغ کردنی ئەو دادگایەی کە حوکمەکەی دەرکردوە بە مەبەستی ناردنی ئیزبارەی دەعواکە.

**نظر الدعوى الاستئنافية:**

**١- حضور الطرفان او حضور طرف وغياب الاخر:**

لەم حاڵەتەدا دادگای استئناف بەردەوام دەبێ لە تەماشاکردنی دەعواکە – جا ئامادە نەبونەکە بە هۆی بیانویەکی ڕەواوە بێت یا خود نا – و ئەو حوکمەی کە دەردەچێ بە حوکمێکی حضوری هەژمار دەکرێت بەرامبەر ئەو لایەنەی کە ئامادە نەبووە، ودەکرێ تانەی لێ بگیرێ بەڕێگەی تمییز نەك اعتراض على الحكم الغيابي.

**٢- غياب الطرفان:**

لەم حاڵەتەدا ئەگەر ئامادەنەبوونەکە لە یەکەم دانیشتن بوو یان لە دانیشتنێکی تر ئەوا دادگا تەماشای دەعواکە ناکات وچاوەڕێ دەکات هەتا (٣٠) ڕۆژ، ودوای تێپەڕبوونی ئەم ماوەیە عەریزەی دەعوای استئناف ابطال دەبێت وناکرێ جارێکی تر بەرزبکرێتەوە.

**الاستئناف المتقابل:**

ئەو استئنافەیە کە کەسی مستأنف عليه ( ئەو کەسەیە کە استئنافی لە دژ بەرزکراوەتەوە) بەرزی دەکاتەوە لە دژی ئەو کەسەی کە یەکەم جار ڕێگای استئنافی بەرزکردۆتەوە.

**پ/ جیاوازی چی یە لە نێوان استئنافی ئەصلی واستئنافی متقابل؟**

١- ماوەی استئنافی ئەصلی (١٥) ڕۆژە، بەڵام ماوەی استئنافی متقابل بەردەوام دەبێت تاکو پێش تەواو بوونی دانیشتنی یەکەمی مرافعە.

٢- دەبێ لە استئنافی ئەصلی هەموو ئەو مەرجانەی تێدابێ کە پێویستە بۆ دەعوا (الاهليه . المصلحه . السبب) لەگەڵ دیاری کردنی هۆکاری استئناف، بەڵام لە استئنافی متقابل ئەم مەرجانە پێویست نی یە.

٣- استئنافی ئەصلی بەرزدەکرێتەوە لە دژی لایەنی بەرامبەر ئەگەر چەند کەسش بن، بەڵام استئنافی متقابل بەرزدەکرێتەوە لە دژی – المستأنف - واتا ئەو کەسەی یەکەم جار استئنافی ئەصلی بەرزکردۆتەوە.

**الحكم الاستئنافي:**

پاش ئەوەی دادگای استئناف دەعواکە وەردەگرێت هەڵدەستێت بە تەماشاکردنی هەتا دەگاتە دەرچواندنی حوکم، و ئەم حوکمە پێی دەوترێت حوکمی استئنافی کە سێ حاڵەتی هەیە:

١- فسخ کردنی حوکمی یەکەم.

٢- تأیيد کردنی حوکمی یەکەم.

٣- تعديل کردنی حوکمی یەکەم.

**آثار الاستئناف:**

**١- تأخير تنفيذ الحكم: گرتنەبەری ئەم ڕێگایە دەبێتە هۆی تاخیر بوونی جێ بەجێ کردنی حوکم، وەکو ڕێسایەکی گشتی، تەنها حوکمەکە نفاذ المعجل نەبێ.**

**٢- الغاء إجراءات التنفيذ بعد الفسخ: ئەگەر حوکمی دادگای بەرایی هەڵوەشاندرایەوە لە لایەن دادگای استئنافەوە ئەوا هەرچی إجراوات کراوە پێش استئنافەکە پوچەڵ دەکرێتەوە.**

**سێ یەم: اعادة المحاكمة**

**ڕێگایەکە لە ڕێگاکانی تانەگرتنی نائاسایی بەهۆیەوە حوکم دراو دەتوانێ داوای سەر لەنوێ تەماشاکردنی داواکە بکاتەوە لەبەر بوونی یان دەرکەوتنی ناڕاستیەك یان غەشێك کە حوکمەکە پشتی پێی بەستووە.**

**الاحكام التي يجوز فيها الطعن بطريق اعادة المحاكمة:**

**دەکرێ تانە بگیرێ بە ڕێگەی اعادە المحاکمە لەم حوکمانەی لای خوارەوە:**

**١- ئەو حوکمانەی کە دەردەچێ لە دادگاکانی استئناف.**

**٢- ئەو حوکمانەی کە دەردەچێ لە دادگای بەرایی.**

**٣- ئەو حوکمانەی کە دەردەچێ لە دادگای باری کەسایەتی.**

**٤- ئەو حوکمانەی کە دەردەچێ لە دادگای ماددەی کەسایەتی.**

**٥- ئەو حوکمانەی کە دەردەچێ لە دادگای کار.**

**أسباب اعادة المحاكمة:**

**یاسا چەند هۆکارێکی دیاری کردووە بۆ داواکردنی دووبارە تەماشاکردنی کێشەکە، کە ئەمانەن:**

**١. الغش: ئەگەر لایەنی بەرامبەر غەشی ئەنجامدا بەشێوەیەك کە کاریگەری هەبێت لەسەر حوکمی کۆتایی داواکە.**

**٢. تزوير الاوراق: ئەگەر دوای دەرچونی حوکم لایەنی بەرامبەر دانی نا بەشێوەیەکی نوسراو کە هەستاوە بە تەزویر کردنی ئەو بەڵگانەی کە حوکمەکە پشتی پێ بەستوە یاخود دادگا بڕیاریدا بە تەزویر بوونی.**

**٣- شهاده الزور: ئەگەر حوکمەکە دەرچوو بوو لە سەر بنەمای (اساسی) شاهێدی دانی شاهیدێك پاشان حوکمی لەدژ دەرچوو بە شاهێدی زوور واتا شاهێدی درۆ.**

**٤- إخفاء الاوراق: ئەگەر داواکەری اعادە المحاکمە لە دوای دەرچوونی حوکم چەند ئەوراقێکی گرنگ و کاریگەری بەرزکردەوە کە پێشتر لایەنی بەرامبەری بووە هۆی تقديم نەکردنی.**

**مدة طلب اعادة المحاكمة:**

**ماوەی داواکردنی اعادە المحاکمە (١٥) ڕۆژە، دەست پێ دەکات لە ڕۆژی دواتری بە دەرکەوتنی غەشەکە یان دان پێنان بە ساختەیەکە یان حوکم دان بە شاهێدی زور.**

**اجراءات طلب اعادة المحاكمة:**

**داواکردنی اعادە المحاکمە بە عەریزەیەك بەرز دەکرێتەوە بۆ ئەو دادگایەی کە حوکمەکەی دەرکردووە، وپێویستە چەند بەیاناتێك لە خۆ بگرێت لەوانەش: ناوی ئەو کەسەی داوای اعادە المحاکمە دەکات وناونیشانەکەی، وناوی لایەنی بەرامبەر بە تەفاصیلی، هەروەها باس کردنی پوختەیەك لە ناوەرۆکی حوکمەکە، هەروەها پێویستە ئاماژە بە هۆکاری داواکردنی اعادە المحاکمەکەش بکرێت.**

**نظر طلب اعادة المحاكمة:**

**تەماشای داوای اعادە المحاکمە دەکریٚ وەکو اجرائاتی دادگایەکی ئاسایی بەلاٚم لە چوارچێوەی ئەو هۆکارەی کە هاتووە لە عەریزەی داوای اعادە المحاکمە، و ناکریٚ دادگا سەربەخۆ بچێتە سەر هۆکارێکی تر کە باس نەکراوە لە عەریزەکە.**

**اثار طلب اعادة المحكمة:**

**١- وقف تنفيذ الحكم المطعون فيه:**

**گرتنەبەری ئەم ڕێگایە دەبێتە هۆی ڕاگرتنی جیٚ بەجیٚ کردنی حوکمەکە هەتاوەکو ئەنجامی داوای اعادە المحاکمە ئاشکرا دەبێت.**

**٢- صدور حكم جديد محل الحكم المطعون فيه:**

**ئەگەر بۆ دادگا دەرکەوت کە داواکردنی اعادە المحاکمە لەسەر هۆکارێکی یاسایی ڕاست دروست بنیات نراوە ئەوا پێویستە لەسەری حوکمێکی نویٚ دەربکات.**

**٣- لا يقبل الطعن بطريق اعادة المحاكمة في الحكم الصادر في الطعن باعادة المحاكمة:**

**واتا ناکریٚ تانە بگیریٚ جارێکی تر بەڕێگەی اعادە المحاکمە لەو حوکمەی کە دەردەچیٚ لە ئەنجامی تانەگرتن بە ڕێگەی اعادە المحاکمە، بەلاٚم دەکریٚ تانەی لیٚ بگیریٚ بە ڕێگاکانی تر.**

**چوارەم: التمييز**

**پێناسە:**

**بریتیە لە ڕێگایەکی نائاسایی لە ڕێگاکانی تانەگرتن لە ئەحکامی حچوری وغیابی وبەشێك لە قرارات بە مەبەستی هەڵوەشندنەوەی ئەو حوکم و قەرارانەی کە لە دادگا نزمەکان دەرچووە، وە بەشێوەیەکی گشتی کاری تمییز بریتیە لە تدقیق کردنی ئەحکام و قرارات کە ئایە دەگونجێت لەگەڵ یاسادا یاخود نا.**

**الاحكام والقرارات التي يجوز تمييزها:**

**هەموو ئەو ئەحکامانەی کە دەردەچیٚ لە دادگاکانی استئناف بە سیفەتی استئنافی ودادگاکانی پلە یەك دەکریٚ تەمییز بکرێنەوە، ولەگەڵیدا ئەو قرارانە بەرز دەکرێنەوە کە کێشەکەی پیٚ کۆتایی نایەت، بەلاٚم هەندیٚ قرارات هەن کە دەکریٚ بەشێوەیەکی سەربەخۆ تەمییز بکرێنەوە هەروەکو ئەو قرارانە کە لە ماددەی (٢١٦) دا هاتووە.**

**وياسا جياوازى كردووه له نێوان دوو حاڵەت:**

**يەكەم: الاحكام والقرارات التى يجب تمييزها لدى محكمه التمييز: كه ئەمانەن:**

**١- ئەو ئەحكامانەى كه دەردەچىٚ له دادگاى استئناف به سيفەتى استئنافى.**

**٢- ئەو ئەحكامانەى كه له دادگاى بەرايى دەردەچىٚ لەو دەعوايانەى كه بەهاكەيان له (١٠٠٠) دينار زياتره، هەروەها دەعواى افلاس وتصفييەى كۆمپانياكان.**

**٣- ئەو ئەحكامانەى كه له دادگاى بەرايى دەردەچىٚ كه بەهاكەيان له (٥٠٠) دينار زياتره هەتا دەگاته (١٠٠٠) دينار.**

**٤- ئەو ئەحكامانەى كه له دادگاى بەرايى دەردەچىٚ كه پەيوەنديان هەيه بەو رسوماتانەى كه بەهاكەيان ديارى كراوه هەروەها ئەو دەعوايانەى كه بەهاكەيان ناديارە.**

**٥- ئەو ئەحكامانەى كه دەردەچىٚ له دادگاى بارى كەسايەتى ودادگاى ماددەى كەسايەتى.**

**٦- ئەو ئەحكامانەى كه دەردەچىٚ له دادگاى كار.**

**٧- ئەو ئەحكامانەى كه دەردەچىٚ له دادگاى كارگێڕى.**

**وئەو قرارانەى كه دەكرىٚ تەمييز بكرێنەوه به شێوەيەكى سەربەخۆ له بەرامبەر دادگاى ته مييز ئەو قرارانەى كه له ماددەى (٢١٦)ى ياساى مرافعاتى عێراقيدا هاتووه ئەگەر له دادگاكانى استئناف يان بارى كەسايەتى يان ماددەى كەسايەتى يان دادگاى كار دەرچوو بوو.**

**وه ماوەى تانەگرتنى تەمييزى له ئەحكام (٣٠) ڕۆژه جگه لەو ئەحكامانەى كه له دادگاى بارى كەسايەتى دەردەچىٚ كه ماوەكەى (١٠) ڕۆژه، بەلاٴم قرارات ماوەكەى (٧) ڕۆژه**

**دووەم/ الاحكام والقرارات التى يجب تمييزها لدى محكمه الاستئناف بصفتها التمييزيه:**

**ئەم ئەحكامانه دەگرێتەوه :**

**١- دەعواى قەرز و منقول هەتا (٥٠٠) دينار.**

**٢- دەعواى نەهێشتنى شيوع له منقول يان عقار هەر چەندىٚ بىٚ بەهاكەى.**

**٣- چۆڵكردنى بەكرێدراو هەر چەندىٚ بىٚ بەهاى كرێكه.**

**٤- دەعواى حيازه.**

**٥- دەعواى ئەو قستانەى كه كاتيان هاتووه هەتا وەكو (٥٠٠) دينار.**

**٦- ئەو دەعوايانەى كه ياسايەكى تايبەت ئاماژه بەوه دەكات كه له اختصاصى دادگاى بەرايى يه.**

**وئەو قرارانەى كه دەكرىٚ تەمييز بكرێنەوه له لاى دادگاى استئناف به سيفەتى تەمييزى ئەو قرارانەن كه ئاماژەيان پىٚ كراوه له ماددەى (٢١٦)ى ياساى مرافعات ئەگەر دەرچوو بوو له دادگاكانى:**

**١- دادگاكانى بەرايى.**

**٢- ئەو قرارانەى كه دەردەچن به پێى ياساى تنفيذ.**

**٣- ئەو قرارانەى كه دەردەچن به پێى ياساى استملاك.**

وماوەی تانە گرتنی تەمییزی لەلای دادگای استئناف بەسیفەتی تەمییزی لە ئەحکام (١٠) ڕۆژە، و(٧) ڕۆژە سەبارەت بە قرارات.

**التمييز الوجوبي:**

ئەو تەمیزەیە کە پێویستە لەسەر دادوەر سەربەخۆ حوکمەکە بنێرێت بۆ دادگای تەمییز ئەگەر لایەنەکان تەمییزیان نەکرد، وە ماددەی (٣٠٩) لە یاسای مرافعات ئاماژە بەوە دەکات کە هەندێ ئەحکام هەن کە پێویستە تەمییز بکرێنەوە بەشێوەیەکی وجوبی، لەو ئەحکامانەش: ئەو ئەحکامانەی کە دەردەچن دەربارەی منداڵ یان شێت یان ناقص الاهلیە یان بیت المال یان اوقاف، هەروەها ئەو حوکمەی کە دەردەچێت بە فەسخ کردنی گرێبەستی هاوسەرێتی.

**أسباب التمييز – هۆکارەکانی تەمییز:**

ماددەی (٢٠٣) لە یاسای مرافعات ئاماژە بەم هۆکارانە دەکات کە ئەمانەن:

١- مخالفة القانون او خطأ في تطبيقه: ئەگەر هاتوو حوکمەکە دەرچوو بوو لەسەر أساس وبنەمای پێچەوانەی یاسا یان هەڵە لە جێ بەجێ کردنی یان عەیبێك لە تەفسیر کردنی.

٢- مخالفة قواعد الاختصاص: ئەگەر هات و حوکمەکە دەرچوو بوو بە پێچەوانەی ڕێساکانی إختصاصی وڤیفی ونوعی ومکانی.

٣- مخالفة قواعد الاجراءات: ئەگەر حوکمەکە دەرچوو بوو بە پێچەوانەی ڕێساکانی ڕێوشوێنی ئوصولی دادگایی کردن، وەکو تەنەحی نەکردنی دادوەر لەگەڵ بوونی هۆکاری وجوبی تەنحی کردنی، یان گوێ نەگرتن لە لایەنێك.

٤- صدور حكم يناقض حكماً سابقاً صدر في نفس موضوع الدعوى:

ئەگەر حوکمەکە دەرچوو بوو کە دژی حوکمێکی تر بوو کە پێشتر دەرچوو بوو لەسەر هەمان بابەتی دەعوا ولە نێوان هەمان لایەن.

٥- اذا وقع في الحكم خطأ جوهري:

واتا ئەگەر حوکمەکە هەڵەیەکی سەرەکی تێدابوو، بۆ نموونە: هەڵەکردن لە تێگەیشتنی واقعەکە، یان یەك لایی نەکردنەوەی لایەنێك لە لایەنەکانی دەعواکە، یان یەك لایی کردنەوەی شتێك کە لایەنەکان داوایان نەکردبوو...... هتد.

**اجراءات الطعن:**

تەمییز هەر وەکو دەعوایەك بەرزدەکرێتەوە بە عەریزەیەکی نوسراو بۆ دادگای تەمییز یان دادگای استئناف بەسیفەتی تەمییزی، وە پێویستە ئەم عەریزەیە کۆمەڵێ بیانات لەخۆ بگرێت لەوانەش: ناوی لایەنەکان و شوێنی نیشتەجێ بوونیان و ناوی ئەو دادگایەی کە حوکمەکەی دەرکردووە و هۆکاری تەمییز کردنەوەکە.

**كيفية نظر الطعن:**

دادگای تایبەتمەند بە تەماشای تانەی تەمییزی دەست دەکات بە تدقیق کردنی حوکمەکە لە ڕوانگەی عەریزەکەوە، بێ ئەوەی بانگی لایەنەکان بکات – وەکو ڕێسایەکی گشتی– بەڵام ماددەی (٢٠٩) لە یاسای مرافعات ڕێگەی داوە بە دادگای تەمییز کە بانگی لایەنەکان بکات بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر، بەڵام ئەم بەندە یاساییە بە کەمی جێ بەجێ دەکرێت لە واقعدا، وە دادگای تەمییز دەتوانێ هەر ڕێوشوێنێك بگرێتەبەر کە یارمەتی بدات بۆ یەکلایی کردنەوەی تانەکە، وەکو سوود وەرگرتن لە خبراء .....هتد.

**الحكم في الطعن:**

دوای ئەوەی دادگای تەمییز تەواو دەبێت لە تەدقیق کردنەوەی حوکمەکە ئەوا بڕیاری خۆی دەردەکات کە یەکێ لەمانەی لای خوارەوەیە:

**١– احالة الطعن التمييزي الى المحكمة المختصة بنظره:**

ئەگەر بۆ ئەو دادگایەی کە عەریزەکەی بۆ لای بەرزکراوەتەوە دەرکەوت کە ئەم دادگایە تایبەتمەند نی یە بە تەماشاکردنی ((وەکو ئەوەی عەریزەکە بەرزبکرێتەوە بۆ لای دادگای تەمییز بەڵام خۆی لە اختصاصی دادگای استئنافە بەسیفەتی تەمییزی)) ئەوا لەم حاڵەتەدا دادگا بڕیار دەدات بە احالەکردنی (ناردنی) عەریزەی تەمییز و إزبارەی دەعواکە بۆ ئەو دادگایەی کە تایبەتمەندە بە تەماشاکردنی.

**٢– رد العريضة التمييزية:**

ئەگەر بۆ دادگا دەرکەوت کە عەریزەی تەمییز بەرزکراوەتەوە پاش تەواوبوونی کاتی یاسایی خۆی یان هیچ هۆکارێکی تانەگرتنی تێدا نەبوو ئەوا دادگا بڕیار دەدات بە ڕەدکردنەوەی عەریزەکە بێ ئەوەی تەماشای بابەتی دەعواکە بکات.

**٣– نقض الحكم:**

ئەگەر دەرکەوت بۆ دادگا کە ئەو حوکمەی تانەی لێ گیراوە هۆکارەکانی تەمییزی تێدایە ئەوا دادگا بڕیار دەدات بە نقچ کردنی حوکمەکە و ناردنەوەی بۆ ئەو دادگایەی کە حوکمەکەی دەر کردووە بۆ ئەوەی دووبارە یەکلایی بکاتەوە لە ڕوانگەی بڕیاری دادگای تەمییز.

**٤– نقض الحكم والفصل في الموضوع:**

ئەگەر دادگا بڕیاریدا بە نقچ کردنی حوکمەکە لەبەر ئەوەی پێچەوانەی یاسایە یان هەر هۆکارێکی تر، ودەعواکە ئامادەبوو بۆ یەکلایی کردنەوەی ئەوا پێویستە لەسەر دادگای تەمییز بڕیاری یەکلایی کردنەوەی دەربکات، وە ئەم بڕیارەی دەکرێ تانەی لێ بگیرێ بە ڕێگەی ((تصحيح القرار التمييزى)).

**اثار الطعن:**

١- گرتنەبەری ئەم ڕێگایە دەبێتە هۆی ڕاگرتنی جێ بەجێ کردنی حوکمەکە، بەڵام ئەگەر پەیوەست بوو بە ماڵێکی منقول ئەوا تەمییز کردنی نابێتە هۆی ڕاگرتنی جێ بەجێ کردنی حوکمەکە تەنها ئەگەر لایەنی تانەگر کەفیلێکی دانا.

٢- ئەگەر حوکمە تانە لێ گیراوەکە دەرچوو بوو لە لایەن دادگای بەرایی یەوە بە پلەی کۆتایی یان لە لایەن دادگای باری کەسایەتی ئەوا لەم حاڵەتەدا بڕیاری دادگای تەمییز واجبە جێ بەجێ بکرێت بە تەواوەتی.

٣- بەلأم ئەگەر حوکمە تانە لێ گیراوەکە دەرچوو بوو لە لایەن دادگای استئناف یان دادگای بەرایی بە پلەی یەکەم یان دادگای کار ئەوا لەم حاڵەتەدا بڕیاری دادگای تەمییز واجبە جێ بەجێ بکرێت تەنها لە ڕووی اجرائاتی اصولیەوە، تەنها ئەگەر هات و بڕیاری دادگای تەمییز لەلایەن دەستەی بەرفراوان -الهیئە الموسعە- دەرچوو بوو ئەوا واجبە جێ بەجێ بکرێت بە تەواوی.

**پێنجەم: تصحیح القرار التمییزی:** یاسای مرافعات ڕێگەی داوە بە شێوەیەکی ئیستسنائی تانە بگیرێ لە بریارەکانی دادگای تەمییز بەم ڕێگایە ئەگەر چەند هۆکارێك هاتەدی کە یاسا دیاری کردووە.

**القرارات التمییزیة التي یمکن طلب تصحیحها:**

ئەو قرارانەی کە دەردەچن لە دادگای تمییز ودادگای ئیستئناف بە سیفەتی تەمییزی ناکرێ تانەیان لێ بگیرێ تەنها بە ڕێگەی تصحیح القرار التمییزی لە بەرامبەر هەمان ئەو دادگایەی کە حوکمەکەی دەرکردووە کە مەبەستە ڕاست بکرێتەوە ئەگەر لەو بریارانە بوو کە حوکمەکەی دادگا نزمەکانی پشت ڕاست دەکردەوە (المصدقە للحکم)، یان حوکمەکەی نقچ دەکردەوە.

بەلأم ئەگەر بڕیارەکە لە لایەن دەستەی گشتی یەوە - الهیئە العامە - دەرچوو بوو ئەوا ناکرێ تانەی لێ بگیرێ بەم ڕێگەیە، هەروەها تانەگرتن بەم ڕێگەیە تەنها بۆ یەك جار دەبێ.

**مدة تصحیح القرار التمییزي:** ماوەی تانەگرتن بەم ڕێگەیە (٧) ڕۆژە دەست پێ دەکات لە ڕۆژی دواتری تەبلیغ کردنی لایەنەکان، وئەم ماوەیە کۆتایی پێ دێت لە هەموو کاتێکدا بە تێپەڕ بوونی (٦) مانگ بەسەر دەچوونی ئەم بڕیارە.

**اسباب طلب تصحیح القرار التمییزي:**

١- ئەگەر داواکاری تصحیح پێشتر هۆکارێکی پێشکەش کردبوو بە دادگای تەمییز بە مەبەستی نقچ کردنی حوکمەکە یان پشت ڕاست کردنەوەی بەلأم دادگای تەمییز گوێی نەدابوو ئەم هۆکارە لە بریارە تەمییزیەکەی.

٢- ئەگەر بریاری تەمییزی پێچەوانەی بەندێکی صەحیحی یاسا بوو.

ئەگەر بریاری تەمییزی دژ یەك بوو لە ناو خودی خۆی یاخود دژیەك بوو لەگەڵ بریارێکی تری دادگای تەمییز کە دەرچوو بوو لەسەر هەمان بابەت وهەمان لایەن.

**آثار الطعن بطريق تصحيح القرار التمييزي:**

١- تأخر تنفيذ الحكم: گرتنەبەری ئەم ڕێگایە دەبێتە هۆی ڕاگرتنی جێ بەجێ کردنی حوکم.

٢- ئەگەر حوکم دەرچوو لەسەر تانەی تصحيح القرار التمييزي ئەوا ناکرێ تانەی لێ بگیرێتەوە بە ڕێگەی تصحيح القرار التمييزي جارێکی تر.

٣- بۆ یەك جار مافی تانەگرتن هەیە بە ڕێگەی تصحيح القرار التمييزي، واتا ئەگەر تانەگیرا بەم ڕێگەیە پاشان هۆکارێکی تر هاتەکایەوە ئەوا ناکرێ جارێکی تر تانە بگیرێ بە هەمان ڕێگە.

**شەشەم: اعتراض الغير**

**پێناسە:** ڕێگایەکە لە ڕێگاکانی تانەگرتنی نائاسایی، یاسادانەر بەخشیوەتی بە ئەو کەسەی کە لایەن نەبووە لە دەعواکە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حوکمەکەی کە دەرچووە زەرەری بە بەرژەوەندیەکی ڕەوای گەیاندوە.

**الاحكام التي يجوز الطعن فيها بطريق اعتراض الغير:**

ماددەی (٢٢٤) لە یاسای مرافعات ئاماژەی بەوە کردووە کە هەر حوکمێك دەردەچێت لە دادگای بەرایی یان ئیستئناف یان باری کەسایەتی ئەوا دەکرێ تانەی لێ بگیرێ بەم ڕێگایە.

**الشروط الواجب توافرها في الحكم المعترض عليه:**

١- ان يكون الحكم متعدياً الى المعترض: واتا دەبێ ئاسەواری حوکمەکە کەسی معترچیش بگرێتەوە.

٢- ان يكون الحكم من الاحكام التي يجوز الطعن فيها بطريق اعتراض الغير.

٣- ان يكون الحكم قد سبب للمعترض ضرراً: واتا حوکمە دەرچووەکە زەرەری بە بەرژەوەندیەکی ڕەوای کەسی معترچ گەیاندووە.

**جۆرەکانی اعتراض الغير:**

١- اعتراض الغير الاصلي:

ئەو جۆرە اعترازەیە کە پێشکەش دەکرێ بە شێوەی دەعوایەکی سەربەخۆ بۆ هەمان ئەو دادگایەی کە حوکمەکەی دەرکردووە، (بەرایی - ئیستئناف- باری کەسی).

٢- اعتراض الغير الطارئ:

ئەو جۆرە اعترازەیە کە پێشکەش دەکرێ بە شێوەی دەعوایەکی حادپە لە لایەن یەکێ لە لایەنەکانی کێشەکە ولە کاتی تەمەشاکردنی دەعوا ئەسڵی یەکە، بەڵام اعترازەکە پێشکەش دەکرێ لەسەر حوکمێکی پێشوتر کە لایەنی بەرامبەر بەرزی دەکاتەوە بۆ ئەوەی دەعوا ئەسڵی یەکە بسەلمێنێ.

**مدة الاعتراض:**

یاسا ڕێگەی داوە دەعوای اعتراض الغیر بەرز بکرێتەوە هەتاوەکو پێش جێ بەجێ کردنی حوکمەکە لەسەر کەسی معترض، بەڵام ئەگەر حوکمەکە جێ بەجێ کرا ئەوا مافی سقوط دەکات لە تانەگرتن بەم ڕێگەیە. بۆیە ئەگەر حوکمەکە جێ بەجێ کرا لەسەر کەسی معترض ئەوا مافی تانەگرتنی بەم ڕێگەیە دەمێنێ هەتاوەکو (٧) ساڵ، کە ئەم ماوەیە ماوەی تەقادمی ئەحکامە.

**آثار اعتراض الغیر علی الحکم:**

١- گرتنەبەری ئەم ڕێگەیە نابێتە هۆی دواخستنی جێ بەجێ کردنی حوکوم تەنها ئەگەر دادگا هەستی کرد کە جێ بەجێ کردنی دەبێتە هۆی توشبوونی کەسی معترض بە زەرەرێکی جەسیم.

٢- اعادة نظر الدعوی: واتا گرتنەبەری ئەم ڕێگەیە دەبێتە هۆی دووبارە تەمەشاکردنی دەعواکە لە سنووری خاڵی اعترازەکە.

٣- ئەو حوکمەی کە دەردەچێ لە ئەنجامی دەعوای اعتراض الغیر دەکرێ تانەی لێ بگیرێ بە هەموو ڕێگاکانی تانەگرتن وەکو اعتراض علی الحکم الغیابي یان ئیستئناف یان تەمییز ... هتد.